✪ ناوی کتێب: پێ بە پێی خۆشەویست (ﷺ)

✪ نوسینی: م. عەمر خالید

✪ وەرگێرانی : ئامانج محەمەد ئەمین

✪ پێداچوونەوەی: م. بورهان محەمەد ئەمین

✪ تایپ و دیزاین: بەهرە محەمەد حەسەن ، عماد عەبدولقادر

✪ هەڵەچنی : بەهار حەسەن ، گوڵنار وەسیم

✪ نەخشەسازی بەرگ: ئومێد محەمەد قەرەداغی

✪ ژ. سپاردن: (٩٥٩) ی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ

✪ تیراژ: ( ٣٠٠٠ ) دانە

✪ چاپی یەکەم بەهاری ٢٠٠٧ز

✪ نرخی کتێب: (٣٠٠٠ ) دینار



بسم الله الرحمن الرحيم

**دەسپێک :**

کاتێك هەموو ئەو کتێب و سەرچاوە ڕەنگالأنە دەکەوێتە بەرچاو لەژیننامەی پیرۆزی پەیامبەری خوا (محمد)(ﷺ) ئەوشارە مێرووانەت دێتە بەرچاو کەلای خۆیانەوە پەروانە ئاساو بیٚ‌وچان بەدەوری خۆیاندا پێیە بچوکەکانیان دەنێن بەسەر ئەم زەویە زەبەلاحەداو ڕۆزی بۆ خۆیان و نەوەکانیان جمع دەکەن بیٚ‌ئەوەی گەورەیی ئەو زەویە دەرك بکەن کە لەسەری دەژین ...

هەموو ئەوهەولأنەیشی کە لەپێناو ناسین و ئاشنابوونمان بەم پێغەمبەرە نازدارە ئەنجام دەدرێت وەك هەولی مێروەکان بچوکن بەلأم پاداشتەکان بەهادارو پڕبایەخن و مرۆڤایەتی ئاتاجە پێیان، لەخوای پەروەردگار داواکارم وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەئەندازەی دەنکە گەنمی دەم مێرووەکانیش بێت جێگەی خۆی بگرێت چونکە وەك خوای گەورە خۆی دەفەرموێت ﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ هیچ شتێك لای ئەوزاتە ون نابێت و دەنکێك وتۆوێك دەکاتە خەرمانێك.

**ئامانج محەمەد ئەمین**



## دەوڵەمەنترین ئەزمونی ژیان لەمێژوودا

## لەژیاننامەی پێغەمبەردایە (ﷺ)

بۆچی پێویستە لەژیاننامەی پێغەمبەر شارەزابین؟ سێ هۆکار هەن بۆ خوێندنی ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیز، ژیاننامەی پێغەمبەر سەرکەوتووترین ئەزمونە کەمرۆڤایەتی پەی پێبردبێت، پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) هەڵسا بەگۆرینی یاساکانی جیهان، بۆ ئایندەی جیهان هەتا کۆتایی دنیا، لەبەرئەوە پێغەمبەر(ﷺ) باشترین پێشەنگە بۆ سەرجەم نەوەو سەدەکان تاکە کەسێکە لەمێژوودا شایستەی ئەوە بێت بیکەینە پێشەنگ لەهەموو بوارەکانی ژیانماندا.

- ئەگەر دەوڵەمەندی ئەوا چاو لەپێغەمبەر بکە ئەوکاتەی بازرگان بوو، شمەك وکەل وپەلی لەنێوان حیجازو یەمەندا وەلەنێوان شام و حیجازدا ئاڵوگۆڕ دەکرد.

ئەگەر هەژارو دەست کورتیشی، ئەوا گەمارۆی شیوی (ابو طالب) بکەرە پێشەنگی خۆت، یاخود ئەوکاتەی لەنیشتمانی خۆی وەدەرنراو بەرەو مەدینە کۆچی کرد، بێئەوەی هیچ ماڵ و دارایەکی پێبێت...

ئەگەر پادشاو دەسەڵاتداریت ئەوا شوێن سوننەت وکردەوەکانی بکەوە ئەوکاتەی دەسەڵاتداری دورگەی عەرەب بوو، توانی ئاسۆی بیریان بگۆڕێت گەورەو دەسەڵاتدارەکانیان مل کەچ وگوێڕایەڵ بکات و خەونە ناپەسەندەکانیان بڕەوێنێتەوە...

ئەگەر کەسێکی بێدەسەڵات و لاوازیت، ئەوە ئەو ڕۆژانە بکەرە پێشەنگێکی چاك کە لەژێر چەپۆکی یاسای بێباوەڕاندا بوو...

خۆ ئەگەر سەرکەوتوو و براوەیت ئەوا ڕۆژانی سەرفرازی بکەرە پێشەنگی خۆت لەبەدرو حنین و ڕزگارکردنی مەککەدا...

ئەگەر خوانەخواستە تێکشکاویت، غزای ئوحد بکەرە مۆچیاری، کەلەنێو هاوەڵانی شەهیدو بریندارى نێو گۆڕەپانی جەنگەکەدا گیری خواردبوو،تەنانەت خۆیشی هێرشی کرایە سەرو بریندار بوو ...

ئەگەر قوتابیەکی فێرخوازیت ئەوە ئەو دیمەنە بهێنەرە پێش چاوت کەلەسەر ئەژنۆ لەبەردەستی جبریلدا دادەنیشت و فەرموودە پیرۆزەکانی لێوەردەگرت ...

خۆ ئەگەر مامۆستایت سەرنج بدە ئەوکاتانەی هاوەڵانی لەنێو مزگەوتدا فێری خواپەرستیو چاکەخوازی دەکرد.

ئەگەر ئامۆژگارو ڕێنمونیکارێکی ڕاستگۆیت،ئەوا گوێی بۆڕادێرە، ئەوکاتانەی لەمزگەوتەکەیدا ڕێنمونی خەڵکی دەکرد.

ئەگەر بێ باوکی، ئەوا هەتیویو بێنازی ئەو نازدارە بێنە بەرچاوت کەچاوی هەڵهێنا باوکی دیار نەبوو، پاشانیش لەتەمەنی ٦ساڵیدا لەنازی دایکیشی بێبەش بوو ...

ئەگەر گەنجیشی ئەوا بەسەرهاتی سەردەمی شوانیەکەی بخوێنەرەوە کەنمونەی ڕەوشت بەرزیو چاوپارێزی بوو ...

ئەگەر دادوەری، یان ناوبژیوانیت ئەوەسەرنجی هەڵوێستە ژیرانەکەی بدە لەدانانی بەردەڕەشەکەدا لەکاتێکدا سەرانی قورەیش خەریك بوو بەشەڕبێن، پاشان جارێکی تر چاو بخشێنەرەوە بەو ڕۆژانەدا کە لەنێو مزگەوتی مەدینەدا سەرقاڵی ڕێکخستنی کاروباری خەڵکیو چارەسەرکردنی کێشەکانیان بوو، لای ئەو هەژارو نەدار لەبەرانبەر دەوڵەمەندی خاوەن سامان چوون یەك بوو..



ئەگەر هاوسەریت ئەوا ژیاننامەی پاك وبێگەردی هاوسەریی لەگەڵ هەردوو خاتوو (خدیجە)و (عائشە)بخوێنەرەوە.

خۆ ئەگەر باوکیشت ئەوا سەیری ڕەفتاری باوکی (فاطمة الزهراء) باپیری حسن وحسین بکە ..

ئیتر هەر کەسێکیت، لەهەر کارێکدا لەهەر بارودۆخێکدایت، ئەوا ژیاننامەی محمد(ﷺ) ڕێنمویەکی چاك و پێشەنگێکی پڕ لەفەروبەرەکەتە بۆ ڕەوانەوەی تاریکیەکانی ژیان، بۆ ڕێکخستنی کارەکان، بۆ لێبڕان و کۆڵنەدان..

### ۞ گەورەترین کەسایەتی لەنەوەکانی ئادەمدا :

لەدوای هەموو ئەمانە محمد(ﷺ) لەهەموو شتێکدا مەزن و شکۆمەندە لەهەموو بوارەکاندا نمونەیە .گەورەیە لەڕەوشتدا:

- (پێغەمبەری خوا هەرگیز تورە نەبووە )
- (پێغەمبەری خوا هەرگیز لەپەیمانی خۆی پەشیمان نەبۆتەوە)
- (هەرگیز بۆخۆی تۆڵەی نەسەندوە)
- (لەژیانیدا لەئافرەتی نەداوە )
- (هەرگیز درۆی نەکردوە)

پێش بوونی بەپێغەمبەر بەناوبانگ بووە بەڕاستگۆیی‌و دەست پاکی، دوای بوون بەپێغەمبەریش خاتوو (عائشە)ی دایکمان دەفەرموویێت (ڕەوشتی ئەو زاتە قورئان بوو ) .

**هەروەها مەزنە لەتێڕوانینە سیاسیەکاندا** :لەکاتی جەنگی (الأحزاب)دا فەرمووی ( لەمڕۆ بەدواوە لێیان کەم دەکەینەوەو لێمان کەم ناکەنەوە) بێگومان ئەوەش بەڵگەیە لەسەر پێشبینی ڕەوای .



**گەورەیە لەڕوحانیاتدا:**

نوێژی دەکرد هەتا قاچەکانی دەئاوساو پاشان دەیفەرموو: (ئەی نابێت، بەندەیەکی سوپاسگوزار بم ؟!)

**گەورەیە لەبەخشینی دوژمنەکانیدا:**

لەڕزگارکردنی مەککەدا بەخەڵکەکەی فەرموو (بڕۆن هەمووتان ئازادن )

**گەورەیە لەچاندنی هیوا لەدڵی بڕوادارانداا:**

(سوێند بەخوا ئەم دینە ئەگاتە ئەو شوێنەی کەشەوو ڕۆژی پیّدەگات، بەجۆرێك ئافرەت لەحیرەوە بەتەنها لەماڵی خۆی دێتەدەر لەخوا نەبێت لەکەس ناترسێت ).

**گەورەیە لە ئازایەتیدا:**

لەڕۆژی جەنگی حنین دا کەدەوری چۆڵ بوو فەرمووی (من پێغەمبەرم بیّدرۆ، من نەوەی (عبدالمطلب)م).

**گەورەیە لەتوانای کۆکردنەوەی خەڵکیدا:**

تواناکانی خەڵکی ئەزانی، بۆیە هەریەکەی لەشوێنی تەواوی خۆیدا دادەنا.

**گەورەیە لەگەڵ گەنجاندا :**

گەنجانی لەهاوەڵان کۆدەکردەوە پێشبڕکێی تیرهاوێژی بۆڕێك دەخستن و دەیفەرموو: ئەی نەوەی ئیسماعیل ئێوە تیرهاوێژن، باوانی ئێوە تیرهاوێژ بوون، من لەگەڵ فلان و فلان دەبم لەدژی فلان وفلان .. بەمەش تیمەکەی پێغەمبەر تیرەکانیان دەهاویشت و تیمەکەی بەرامبەریان نەیان دەهاویشت!! ئەوسا دەیفەرموو: بۆچی نایهاوێژن؟ ئەیانوت: چۆن تیربهاوێژین کەتۆیان لەگەڵدا بیت؟! پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: تیرەکانتان بهاوێژن من لەگەڵ هەمووتانم ...



**گەورە بوو لەبەرچاوی هاوسەرەکانی:**

شایەتی‌دانی خاتوو(خدیجە) کەفەرمووی: (واللّه) خوای گەورە توشی نەهامەتیت ناکات چونکە تۆچاکەخوازی، خێرخوازی، خزم دۆستی..هتد



## پێشەکی

پێبەپێی خۆشەویست(ﷺ)چەند وشەیەکن گەورەترن لەبەرنامەیەك، مەزنترن لەپەڕاوێك، ئەمە ژیانی مرۆڤێکی تایبەتە کەخوای گەورە هەڵیبژاردووە تابەرنامەی پڕ لەدادو میهری پیادەبکات لەزەویدا ...

پێبەپێ‌ی خۆشەویست(ﷺ)...هەنگاو و نەخشەکانی کاریگەری لەدەرون و، ژیری لەدڵەکاندا دادەڕێژێت، تا بەتێپەڕبونی نەوەکان بەشانازییەوە ببێتە نمونە بۆ ژیان، ڕۆژانێك نین بگۆڕدرێن یان چەند وتارێکنین بسڕێنەوە ...

◉ پێ بە پێی خۆشەویست: لەپەیوەندیدا بەخوای گەورەوە، لەهەموو ساتەوەختەکاندا، لەیادکردنی زاتی پەروەدگاردا، لەنوێژخوێندنیدا، لەڕۆژوگرتن و وتارەکانیدا، لە قورئان خوێندن وکرنوش بردنیدا، پشتی بەخوا بەستوەو متمانەی پێی بووە، وەنوێژ خۆشەویسترین دیمانەو گلێنەی چاوە پیرۆزەکانی بووە .

◉ پێ بە پێی خۆشەویست: لەپەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا، ڕاستگۆو ئەمیندارە، بەخشندەو میهرەبانە، هاوسەرێکی خۆشەویستە، باوکێکی بەسۆزە، کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی ناوازەیە ...

◉ پێ بە پێی خۆشەویست: لەکەسایەتیدا پێشەنگە، دووربینە، پلان دانەرێکی سەرکەوتووە، خاوەنی توانستێکی باڵایە لەچارەسەرکردنی قەیرانەکان و زاڵ بوون بەسەر نارەحەتیەکاندا، بە هیچ جۆرێك نائومێدی ڕوی تێ‌ناکات.

◉ پێ بە پێی خۆشەویست: لەبەرنامەی چاکسازی‌و خەمخۆری بۆ ئاینە ناوازەکەی بێ‌وێنەیە بوو، ئەوەتا لەگەڵ کەمینەیەکی چەوساوەی ئارامگردایە، لەسەرکەوتنەکاندا سوپاسگوزارە، لەگەیاندنی بانگەوازی خوایدا خۆنەویستە،

قۆناغەکان بەوردی دەخوێنێتەوە، توانایيەکی بێ هاوتای هەیە خۆگونجاندنێکی ئیجابی بۆ ڕووداوەکان هەیە ...

◉ پێ به پێی خۆشەویست: چەند ووشەیەکن دڵان پڕنور دەکەن، چەندە خۆشبون ئەوکاتانەی کە لەخزمەتیدا بووم(ﷺ)بەدوای هەنگاوەکانیدا دەگەڕام.

ژیانی بەدەورمدا لێوان لێوکرد لەسەرسوڕمان وخۆشەویستی لەڕاستیدا ژیانی ئەوزاتە کۆڵنەدەرە، ئەزمونێکی مرۆیی نیە هەتا کتێبەکانی پێ پڕبوبێتەوە، بەڵکو پرۆگرامێکی درەوشاوەیە، نرخ بۆ ژیان دەڕوێنێت لەدەرونەکاندا، داهێنان لەو خێرە وێنە بۆکێشراوەدا دەکات، هەنگاوەکان پیرۆز دەکات، ئومەتەکەی ئەو خۆشەویستە(ﷺ) سەردەمانێك هەنگاوەکانی شاراوە بوون لای ئەو خۆشەویستە(ﷺ)بەلام ئەمڕۆ بەویستی خوا هەنگاوەکانی بەتاسە وسۆزەوە، بەئیرادەو ویستێکی بەهێزەوە، بەوپەڕی ڕاستگۆیی‌و باوەڕەوە ئاشکرا دەبێت: هەموومان لەگەڵ هەنگاوی خۆشەویست داین ...

کەواتە ئەی ئومەتی پێغەمبەری خۆشەویست، وەرن باسەر لەنوێ خۆشەویستەکەمان بەسەر بکەینەوە، وەرن باپێکەوە شوێن هەنگاوەکانی بکەوین ... ئەوەتا سەبای سەحەر درەوشاوەیەوەو وەدەرکەوت، ئەوەتا ئومەت سەرەتای بێداربوونەوەیەتی ...یەکەم کارێ کە ئەم بێداربوونەوە پیرۆزە دەیەوێت ئەنجامی بدات زانیاریەکی قوڵە بەهەنگاوەکانی پێشەوا مەزنەکەی، پێوانی تاك وکۆمەڵگەیە بەڕێنموییەکانی، لەوەودوا سوربونە لەسەر ڕێگاکەی بەمەبەستی پتەوکردنی ئەم هەنگاوانە لەواقیعی ژیاندا ...

بۆیە لەوانەیە خۆشەویستیمان بۆ ئەو زاتە هەنگاوێك بێت لەسەر ئەو ڕێبازە .



ئەی خۆشەویست(ﷺ) وابزانم ئوممەت خۆی کردووە بەشەپۆری دەستپێکردنی هەستانەوە، ئەوەتا شوێن هەنگاوەکانت دەکەوێت ئەی پێغەمبەری خوا...

بەو هیوایەی کۆتایی هەنگاوەکان: سەرکەوتنی هاوتای دنیاو نیعمەتی مانەوەی هەمیشەیی دەستەبەر بکات... لە ئایندەدا. ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً﴾(الأحزاب/٢١) .

۞ ئەی خۆشەویست(ﷺ) ...

لەکاتێکدا ئەم نامیلکەیە پێشکەشی ئوممەتە خۆشەویستەکەت دەکەم، لەخوای بالآدەست دەخوازم بیکاتە هەنگاوێك پیبەپێی هەنگاوەکانت، هەروەها کۆمان بکاتەوە لەخزمەتتداو شەرەفی شەفاعەتی ئێوەمان دەست بکەوێت لەو ڕۆژەدا کە ماڵ وسامان و نەوە فریای کەس ناکەوێت بەڵکو تەنها دڵی پاك و پڕ لەئیمان کەپەسەندی لای خوای گەورەیە، فریای خاوەنەکەی دەکەوێت.

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ).. بەنیازی دیدار، بە نیازی دیدار لەو شوێنەی کۆتایی هەنگاوەکەت بوو...



**الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله(ﷺ)وبعد ...**

ئەو وانانەی کە لەژیانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)وەردەگیرێن زۆرن....

وانەکانی هیوا بون و پەرێزگرتن لەنائومێدی، وانەکانی ڕەوشتە باڵاکان ... وانەکانی حەق و بەرگری کردن لەڕاستیەکان ودەست گرتن پێیانەوە ... وانەکانی قوربانیدان بەهەوڵ و بەخشین ... وانەکانی نەخشەدانان و هونەری بەرێوەبردن .. وانەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەرەکانیدا ... وانەکانی ژیانی خێزانداری، خۆگریو ئارامی ... وانەکانی هەڵسانەوەو چۆنیەتی نەخشەدانان بەمەبەستی هەڵسانەوەی ئوممەت ...

سێ هۆکار پاڵنەرمانە بۆ خوێندنی ژیننامەی پێغەمبەر(ﷺ): کە بێدارییەکە مرۆڤایەتی هاوتاکەی ئەوی بەخۆیەوە نەبینیوە ...

سەرکەوتوترین ئەزمونی ڕاپەڕین وهەڵسانەوە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ئەزمونی پێغەمبەرە(ﷺ)بێدایك وباوك، بێخوشك وبرا، تەنانەت کوڕیشی نەبوو، نەخوێندەوار بوو.. لەنێو ئوممەتێکدا هاتە دنیاوە هیچ جۆرێك لەهۆکارەکانی ڕاپەڕین و هەڵسانەوەی تێدا نەبوو، پێکهاتبوون لەچەند هۆزێکی پەرتەوازە، کەچی لەماوەیەی ٢٣ساڵدا لەمێژووی مرۆڤایەتیدا لەئوممەتێکەوە کەشوانی مەڕومالات بوون گۆڕدران بۆ ئوممەتێك کەسەرۆکاری ئوممەتەکانی تر بکەن...

لەڕاستیدا ناردنی پێغەمبەر(ﷺ)بووە جیاکەرەوە بەڵکو خاڵی گۆڕانکاری لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، مێژوو لەپێش هاتنی پێغەمبەردا شتێك بوو دوای هاتنی بووە شتێکی تر وەکو ئەوەی مێژوو سەر لەنوێ نوسرابێتەوە ...

هەردوو زلهێزی جیهانی ئەو سەردەمە ڕۆم و عەجەم ڕوخان ... ئەورووپا لەموسڵمانانەوە فێری زانست بوون... ڕاپەڕینی ئەورووپا لەژێر کاریگەری ئیسلامدا بوو.

کێ بەها نوێکانی وەکو ڕاستی، داد، ئازادی، یەکسانی هێنا، مافی ئافرەت، مافی بەندە، مافی مندالآن، هەموو ئەمانە بەکاریگەری هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو ئیسلام جیهانی پڕکرد لەمزگەوتەکان.. دەنگی بانگ لەڕۆژهەلآت ورۆژ ئاوای زەویدا بەرز بۆوە ...

لەهەموو ساڵێکدا ملیۆنەها موسڵمان حەجی ماڵی خوادەکەن، موسڵمانان وەکو یەك خێزان پێکەوە ڕۆژو دەگرن..

ناوداران لەمیانەی مێژوودا کاریگەریان سنورداربووە، هەریەکێك لەو ناودارانە وەکو ئەسکەندەر، ئەرستۆ، ئەفلاتۆن، ناپلیۆن، ڤۆلتێر، شکسپیر، هەموو ئەمانە ٢٠-٣٠ساڵ دوای مردنیان کاریگەریان کۆتایی هاتووە، بەلآم پێغەمبەری خوا(ﷺ)کاریگەریەکانی هەر بەردەوامە بێگومان تاقیامەت هەر بەردەوام دەبێت... چونکە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ)پێی هەڵسا سەرکەوتوترین ڕاپەڕین بوو لەمێژووی مرۆڤایەتیدا... بەڵێ ڕاپەڕینەکەی سەرجەم مەرجەکانی تیادا بەدیهاتبوو، ئەوەتا زانست وپلان دانان و سیاسەت وهێزی سەربازی، جەنگ وئاشتی هاوسەنگی لەنێوان ڕاستیو ناڕاستی، مادده ورۆح، ئەو ڕاپەڕینەی ئەورووپا کەبەسەرسوڕمانەوە تەماشا دەکرێت تەنها ڕاپەڕینێکی ماددی بێ ڕۆحە ...

بەلآم ڕاپەڕینی ئیسلام تاکە بەرنامەیە کەتوانیویەتی ماددەو ڕۆح شارستانیەت وڕەوشت پێکەوە گرێبدات.. کەواتە سەرکەوتوترین ڕاپەڕینە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، بەڵکو بەوێنەی ئەو نەلەڕابردوو نەلەداهاتودا ڕاپەڕینێکی سەرکەوتوی وا نییەو نابێت ...



**پێشەنگی چاك :**

بێگومان شارەزابوون لەژینامەی پێغەمبەر(ﷺ)بۆ ئەوەیە کەبیکەینە پێشەنگی خۆمان، هەر کەسێك بیەوێت بەدوای پێشەنگێکدا بگەڕێت بۆ ژیانی خۆی لەو زاتە(ﷺ)گشتگیر ترو فراوانتری دەست ناکەوێت... لەبەرئەوەی خوای بالآدەست لەماوەی ٢٣ساڵ لەپێغەمبەرایەتیدا ئەوەی ئادەمیزاد تارۆژی ڕەستاخێز پێویستی دەبێت لەو زاتەدا کۆی کردۆتەوە ..

دیارە لەمێژوی مرۆڤایەتیدا کەسایەتیەکمان دەست ناکەوێت خوای گەورە هەموو ئەوسیفاتانەی تێدا کۆکردبێتەوە کەئادەمیزاد ئاتاجیەتی.. تەنانەت پێغەمبەران هەموو ئەو تایبەتمەندیەی پێنەبەخشیون بۆنموونە:

عیسا پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر گەر بمانەوێت شوێنی بکەوین وبیکەینە پێشەنگی خۆمان، ئەوا وەك کەسایەتیەکی هەژارو دنیا نەویست وگەنجێکی ڕەبەن و لەخواترساو وپارێزگار دەیبینین وە دەیناسین، بەلآم ناتوانین وەك باوك و باپیرو هاوسەرو دەسەلآتدار بەپێشەنگی خۆمانی بزانین وچاوی لێبکەین ..

سولەیمان پێغەمبەریش ئەتوانین وەك دەسەلآتدارێکی دادپەروەر وەك دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار چاوی لێبکەین یان شوێنی بکەوین، بەلآم ناتوانین وەك ستەم لێکراوێکی چەوساوەو لاوازو هەژار شوێنی بکەوین... بەلآم، پێغەمبەرمان(ﷺ)تاکە کەسایەتیەکە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا: ژیانی دەوڵەمەندی، هەژاری، لاوازی، دەسەلآتداریی‌و بەردەستی، پەیماندەر، جەنگاوەر، ئاشتیخواز، لەگەڵ سەراپاری چین و توێژەکانی کۆمەڵگەدا ژیاو تێکەڵ لەگەڵ جولەکەو، مەسیحی، عەرەب و، لەگەڵ عەجەم دا، لەگەڵ تیرەو هۆزە ناکۆکەکاندا،



لەگەڵ هەردوو زلهێزی ئەو سەردەمەدا فارس و ڕۆم، لەگەڵ خەڵکی شارنشین و گوند نشین دەژیاو کارکردی لەسەریان هەبوو.

ئەزمونێکە لەدەوڵەمەندیدا بێهاوتا... ئەگەر دەوڵەمەندی ئەتوانی وەك دەوڵەمەندێك بیکەیتە پێشەنگی خۆت، ئەوکاتەی خاوەنی نێوان دوو کێو بوو لەمەڕومالآت هەموویانی لەپێناوی خوادا بەخشی، خۆ ئەگەر هەژاریشی ئەوا ئەتوانی وەك هەژارێك بیکەیتە پێشەنگی خۆت ئەوکاتەی لەبرساندا بەردی ئەبەست بەسکیەوە لەتاو ئازاری برسێتی.. خۆ ئەگەر کەسێکی ڕزگارکەری ئەتوانی چاوی لێبکەی کاتێك بەگەردن کەچیەوە چووە ناو مەککەوە ... ئەگەر مێردی ئەتوانی چاوی لێبکەیت لەخۆشەویستیو سۆزو لەخۆبردوییو بەرێوەبردنی ماڵیدا،دەتوانیت شوێنی بکەویت لەشەووڕۆژدا، لەسەفەردا، وەك مامۆستا، فێرخواز، دادوەر، هەموو دەتوانن محمد(ﷺ) بکەنە پێشەنگ و مامۆستای خۆیان، هەموو ئەزمونەکانی ژیانی تاقی کردەوە، وەك دادوەرێك لەنێوان عەرەب دا بۆ بنیاتنانەوەی کەعبە، وەك لاوازو گەمارۆدراوێك لەشیوی (ابو طالب)دا ...

بەڕاستی گەورەترین کەسایەتیە لەمێژوودا پەیدابوبێ گەر ووردبینەوە لەژیانی هەریەکێ لەناودارەکانی جیهان دەبینین لایەنێك لەگەورەییان تێدایە یان لەیەك بواردا بە توانان، بۆ نمونە:

شکسپیر لەبواری ئەدەب و هۆنراوەدا، ناپلیۆن لەهێزی سەربازیدا...، گاندی لەسیاسەتدا، ڤۆلتێر لەفیکردا، بەڵام ئەو زاتەی کە هەموو بوارەکانی گەورەیی لەکەسایەتیدا کۆبوبێتەوە بەتەواوەتی پێشەوا(محمد)(ﷺ) .

بەڕاستی ئەو زاتە گەورەیە لەجەنگ وئاشتیدا، گەورەیە.

هەرگیز لەبەر خۆی تورە نەبووە، لەبەر خۆیشی تۆڵەی نەسەندووە، بێ وادەیی و، ستەم و درۆی نەکردووە...

ڕۆژێك (عبدالله )ی کوڕی (أبو السرح) هاتە خزمەتی و ئیسلامەتی خۆی ئاشکرا کردو لەناخیشیدا خیانەتی شاردبۆوە ، پاش ئەوەی عبدالله چووە دەر بەهاوەڵانی فەرموو بۆ ڕێگەتان دا بێتە ژوورەوە، وتیان: خۆزگە بەئاماژەی چاو پێت بوتینایە !!

فەرمووی: پێغەمبەر هەرگیز بەچاوی خیانەت ناکات... پێش بەپێغەمبەر بوون و دوای بەپێغەمبەر بوونی خاوەنی ڕەوشتێکی بەرزبوو، پێش پێغەمبەرێتی ڕاستگۆ و دەست پاك بوو، دوای بەپێغەمبەر بوونیشی ڕەوشتی قورئانی بوو ... لە ڕۆژی خەندەقدا زۆرگەورە بوو، لە ڕۆژی لێبوردنی فەتحی مەککەیشدا هەر گەورە بوو.. لەدنیانەویستیدا گەورەبوو ئەیفەرموو: من چیمە بەسەر دنیاوە، من وەك ئەو ڕێبوارە وام کە لەڕۆژێکی زۆر گەرمدا ئەچێتە ژێر سێبەری درەختێکەوە بۆ پشودان، پاشان دەڕوات و جێی دەهێڵێت، بەڵێ تەنانەت لەگەڵ لاواندا دەیزانی بەچ شێوەیەك وزەو تواناکانیان بەکاربهێنێت...

لەچاوی دوژمنانیشیدا هەر گەورە بوو، ٤٠ ساڵ لەمەککە داو ٢٣ ساڵ دوای پێغەمبەرایەتی تاکە نەنگێکیان لەڕەوشت و کەسایەتیدا نەبینی ...

بۆیەلەڕاستیدا پێشەنگە بۆ هەڵسانەوەی ئوممەت ...

ئەگەر بمانەوێت ئەم ئوممەتە هەڵبستێتەوە ئەبێت لایەنە گەورەییەکانی کەسایەتی لەڕێگای شارەزایی وەرگرتن لە ژیاننامەی‌دا(ﷺ)پەیرەوبکەین.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ﴾ (الحجرات / ٧) .

لەڕاستیدا ئەم ئایەتە تەنها ئاماژەنیە بەهاوەڵان، بەڵکو سەرجەم موسڵمانان دەگرێتەوە لەهەموو زەمان و زەمینەکاندا، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ)



لەناوماندایە بەسوننەت و ڕەوشتە جوانەکانی، بەو میراتە بێ‌شومارو ئەو بنەما ڕەوشتیانەی کەمایەی شانازی سەرجەم مرۆڤایەتیە .

زۆرجار ناودارەکان بەوە ئامۆژگاری دەکرێن کەزۆر دەرنەکەون، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وێنە درەوشاوەیەی کەخەڵکی لەئەندێشەیاندا بۆ ئەو ناودارانەکێشاویانە، چونکە ئەگەر ڕاستیەکان دەربکەون بەو جۆرە نامێننەوە، زۆر مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکیدا کەم وکوڕیەکان ئاشکرا دەکەن، لەبەرئەوەی ئادەمیزادن ئەوەش سروشتی مرۆڤە، زۆربەی کەسایەتیە بەناوبانگەکان ڕایان وایە کەزۆر دەرنەکەون لەبەرئەو هۆیەی کەباسمان کرد .. بەڵام تەنها کەسایەتیەك کەهەرچەند لێی وردبینەوە زیاتر سەرسامی گەورەیی‌و ڕێزی دەبین، ئەویش پێغەمبەری خوایە(ﷺ)... ئەوەتا ئەهلی(الصفة)، هەژارن، زیاتر لە(١٠) ساڵ تێکەڵ بوون و لەنزیك خۆیەوە نیشتەجێی کردن، کەچی خۆشەویستی‌و ڕێزوگەورەیی لەناویانا تادەهات زیاتر دەبوو، دە هەزار جەنگاوەری موسڵمان لەفەتحی مەککەدا بۆماوەی یەك مانگ لەخزمەتیدا ژیان، سەیر لەوەدا بوو بەردەوام خۆشەویستی‌و ڕێزو هەیبەتی لەدڵیاندا هەر ڕووی لە زیادبوون بوو... لەڕۆژانی حەجی ماڵئاواییدا موسڵمانان لەخزمەتیدا تێکەڵ بوون، هەر بۆیە پێی دەفەرموون (خذو عنی مناسککم ) واتە: سروتەکانتان لەمنەوە فێربن. تەنانەت لەدیدی هاوسەرەکانیشیدا زۆرگەورەبوو، ئادەمیزاد دەتوانێت لەبەر چاوی خەڵکیدا خۆی جوان نمایش بکات بەڵام ناتوانێت لەنێو ماڵی خۆیداو لەبەرامبەر هاوسەریدا هەمان کاربکات چونکە زۆر چاك دەیناسێ، ئەوەتا خاتوو خدیجە ( خوالێی ڕازی بێت ) پێی دەفەرموێت:(( سوێند بەخوا هەرگیز خوا تۆ توشی

نەهامەتی ناکات، چونکە تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەپارێزیت ورێز لەمیوان دەگریت ...

خاتو عائشەش ( خوالێی ڕازی بێت ) دەربارەی دەفەرموێت: (( ڕەوشتی ئەو زاتە قورئانیی بوو))... لەوەش زیاتر لەبەرچاوی دوژمنانیشیدا هەر گەورە تەماشادەکرا، ئەوەتا (هەرقل) پادشای ڕۆم کاتێك پرسیاری لە(أبو سوفیان) کرد کەلەوکاتەدا سەختترین دوژمنی پێغەمبەر بوو(ﷺ) نەژادی لەناوتانا چۆنە؟ وتی: لەناومانا نەژادی زۆر بەرزە، وتی : ئایا درۆ دەکات؟ وتی: نەخێر، وتی: فێڵ دەکات؟ وتی: نەخێر، وتی: هاوەڵانی زیاد دەکەن یان کەم؟ وتی: زیاد دەکەن، وتی: کەس لێی هەڵ دەگەڕێتەوە؟ وتی: نەخێر، هەرقل وتی: بەچی فرمانیان پێ‌دەکات؟ وتی: بەنوێژو ڕاستگۆییو داوێن پاکی ... هەرقل وتی: ئەوەی دەیڵێیت گەر وەها بێت ئەم شوێن پێیەی من دەگرێت ...



**بارودۆخی جیهان لەسەرەتای لەدایک بوونیدا (ﷺ)..**

هەردوو دەوڵەتی زلهێزی داگیرکاری رۆم و فارس دەسەڵاتیان بەسەر زۆربەی جیهانی ئەو سەردەمەدا هەبوو ... ستەم بڵاوبوو و باج و خەراج کۆڵی خەڵکی قورس کردبوو، جیاوازی رەگەزیی لەنێو خەڵکیدا بڵاوبوو، بەتایبەت لەنێوان دەوڵەتە داگیرکارو نەتەوە ژێردەستەکاندا ....چەوساندنەوەی نەژادیو ئاینیی باوبوو، خەڵکی لەهەژارییەکی بێسنوردا دەژیان ... راستیو داد دیار نەمابوو، چینێك لەعەیش و نۆش و ئارەزووبازیو رابواردندا دەژیان و چینێکیش لەوپەڕی هەژاریدا. ساسانیەکان لەژێر یاسای چینایەتیدا دەیاننالآند... سوکایەتی بەنرخ و بەهاو بوونی ئادەمیزاد دەکرا ...

ئەورووپاش لەنێو زەلکاوی نەفامیو نەخوێندەواریدا دەژیا، بەهای مرۆیی لەناویاندا وون بوو، رۆشنبیرانیان لەمەڕ ئەو پرسیارە رایان جیاواز بوو کەئایا ئافرەت ئادەمیزادە یان ئاژەڵ، ئایا رۆحی شەیتانی لەگیانیایەتی یان رۆحی مرۆیی، ئایا بۆی هەیە میراتی بەرێت یان نا؟!

(وێلز) مێژوونوسی بەریتانی دەڵێت: جیهان مێژوییەکی وەك سەدەی شەشی زایینی رەشترو تاریکتری بەخۆیەوە نەدیوە ئەورووپا لەو سەردەمەدا وەك لاشەیەکی زەبەلاحی مردوی بۆگەنکردو بوو، جیهان بەوێنەی پیاوێکی ئیفلیجی لەکارکەوتووبوو، ئەوکاتەی محمد پێغەمبەری موسڵمانان وەدەرکەوت.. ئەمەش بەڵگەیەکی زۆر ئاشکرایە کە سەردەمی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ)ئەوپەڕی ناهەمواریو نەهامەتیو توندوتیژی هەبوو، بەڵام سەیر لەوەدا بوو کەئەو زاتە توانی لەماوەی ٢٠ساڵدا لەخاڵی سفرەوە ئومەتێکی خەمخۆری رەوشتبەرز بنیات بنێ ...

لەبەرئەوە ڕەوانیە هیچ کات نائومێدیی‌و بێ‌هیوایی ڕوبکاتە دڵان، چونکە سەدان بنەمامان هەیە لەوبوارەدا تاسەرلەنوێ شوێنی هەنگاوەکانی هەڵبگرین وسەرلەنوێ دەست پێ‌بکەینەوە. پێغەمبەر(ﷺ) دوای بیست ساڵ لەقوربانیدان و هەوڵ و خەبات وتێکۆشان و پلان دانان ژیانی لە ڕووی زەویدا گۆڕی، خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ (الأنبياء / ١٠٧).

واتە: ( ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە تا ببیتە میهرو ڕەحمەت بۆ سەرجەم جیهانەکان ).

جیهان بەدەست شارستانی بێ‌ئابڕوییی‌و بەدڕەوشتیی‌و گومڕایی وەکوئێستا دەینالآند، هەرچەندە زۆر هەوڵدراوە کەشارستانیەتی ڕۆم وساسان بەپیرۆز بناسێنن و لایەنە نێگەتیڤەکان کە زۆرن بشارنەوە بەڵام گەر یەکێك بیەوێت پرسیاربکات دەبێت بڵێت گەر ئەوە حاڵیان بوو چۆن دەیانتوانی هەندێ سەرکەوتن و پێشکەوتن بەدەست بهێنن لەکاتێکدا سوننەتی خواییی لە گەردوون دا بۆ ئوممەتەکان وایە کە گەورەو پایەدار نابن هەتا مەرجەکانی دەسەڵاتداری دەستەبەر نەکەن .... ئەمەش ڕاستە بەڵام واقعی نەوەکان کەبەدوای یەکدا هاتن، بێ‌ئابڕوییی‌و گومڕابوون وستەمکاری بووبەپیشەیان تابەهۆیەوە داڕوخان، ئەمەش ئەو ڕاستیە دوپات دەکاتەوە کە هەموو شارستانیەتێکی مادی دنیایی سەرەتاو کۆتایی هەیە...

جا لەو ساتەوەختەی مێژووی مرۆڤایەتیدا پێغەمبەر(ﷺ)هاتە دنیاوە لەکاتێکدا هەردووشارستانیەتی ڕۆم وفارس خراپترین ساتەکانی ژیانیان دەگوزەراند دواتریش ئاینە مەزنەکەی هاتە ئاراوە تازەوی بە ڕاستیی‌و دادپەروەری بڕازێنێتەوە.... لێرەوە دەبێ هۆشداریيەك بدەین هەردوو



شارستانیەتی ناوبراو داڕوخا لەبەرئەوەی ڕاستی‌و دادی تیا بەرجەستەنەکرا بەڵام بەپێچەوانەوە موسڵمانان توانییان بەو دووچەمکە مرۆڤایەتی ببوژێننەوە ....بۆیە کاتێك ئەم ئوممەتەئەو دوو بەهایەی وونکرد بەرەو دواوە پاشەکشێی کرد دوای ئەوەی ڕەشمەی شارستانیەتی جیهانی بەدەستەوە گرت، کەچی ئێستا لەم کاروانە مرۆڤایەتیەدا جێگەیەکی چنگ ناکەوێت، خۆرئاواش ئەم ڕۆڵەی ئوممەتی گرتەوە دەست لەپێشەنگی کردنی مرۆڤایەتی، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت مادامەکی جڵەوی شارستانیەتیان بەهۆی (ڕاستی‌و دادپەروەریەوە) گرتووە ئیتر هەموو شتێکیان لای ئێمە پەسەندو وەرگیراوە، بەپێچەوانەوە وەك ئاماژەمان پێدا مەرجیش نیە هەرچیەك لای ئەوانەوەبێ بەرپەرچی بدەینەوە خۆ ئەگەر وابوایە ئەوا شەڕی شارستانیەتەکان بەرپا دەبوو کەئەوە ویستراو نیە ... ئێمە ڕاپەرینێکمان دەوێت سەراپای مرۆڤایەتی هەڵبسێنێتەوە نەك خوێنی مرۆڤ بڕژێنێ ...



## بارودۆخی دورگە لەساتە وەختی لەدایک بوونی پێغەمبەردا (ﷺ)

دورگەی عەرەبی لەساتەوەختی لەدایك بوونی پێغەمبەردا (ﷺ)لەنێو تیرەو هۆزە بەشەڕ هاتووەکاندا خەڵکی ژیانێکی تاڵیان دەبردەسەر بەجۆرێك بەهێز لاوازی دەخوارد، دوبەرەکیەکی توندو ململانێ و جەنگی سەخت ڕووی دەدا، بەهۆی نەبوونی ئاسایشەوە ڕێگرییان دەکرد، زۆرێك لەمرۆڤەکان دەفڕێندران لەکاتی سەفەرکردنداو پاشان دەیان کردن بە بەندە وەك (زیدی کوڕی حارثە)، هێرشکردنە سەر یەکی نێو تیرەو هۆزەکان کارێکی ڕۆژانە بوو: لە هۆنراوەیەکیاندا هاتووە:

پەلاماری بەکری برامان دەدەین ئەگەر جگە لەو برایەشمان دەست نەکەوێت، دیارە هۆنراوە ڕاگەیاندنی عەرەب بوو لەوسەردەمەدا، هەروەها لە هۆنراوەیەکی تریانا هاتووە:

ئەوەی ستەم لەخەڵکی نەکات ستەمی لێ دەکرێت!

بەڵام گەر بێت و لەحاڵەتی ئاینییان وردبینەوە ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کەهەزارەها بتیان دەپەرست بەجۆرێك ٣٦٠بت هەر لەناو کەعبەدا دانرابوو!!

تەنانەت هەندێ جار بتەهەڵکۆڵراوەکانیان نەدەپەرست بەڵکو بەردی هەڵنەکۆڵراویان دەهێناو دەیانپەرست و کڕنوشیان بۆ دەبرد!!

هەندێك جار کەسانێکیان هەبوو لەکاتی سەفەرکردنیدا نەیدەتوانی بتەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێت بۆیە هەرچۆنێك بێت بەردێکی پەیدا دەکرد و تالەسەفەرەکەی دەگەڕایەوە دەیپەرست!!

لەدواییدا فڕێی دەدا!! خۆئەگەر بەردیشیان دەست نەکەوتایە ئەوا بتیان لەخورما دروست دەکرد بۆ پەرستنی کاتێکیش برسیەتی زۆری بۆ دەهێنان دەیانخوارد!! بۆیەکاتێك پرسیار کرا لەحەزرەتی عومەر: ئایا ژیرییتان نەبوو؟

فەرمووی: لای خۆی خاوەنی ژیریی بووین بەڵام ڕێبازی هیدایەتمان ون کردبوو.

دیارە ڕێنمویش لای پەروەردگارەوەیە ...

گەر بمانەوێت دەربارەی ئافرەت وحاڵەتی لەدورگەی عەرەبدا بدوێین:

ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کەئافرەت هیچ مافێکی دارایی نەبوو، خاوەنی هیچیش نەبوو، تەنانەت مافی میرات بردنی نەبوو، بەڵکو لەوەش زیاتر ئافرەت وەك کەلوپەلی بۆماوە لەکاتی دابەشکردنی میراتدا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا، تەنها ئەو ئافرەتانە دەرباز دەبوون کەخاوەنی ڕەچەڵەك و نەژادێکی بەرز بوون لەمەککەدا وەك ئامینەی کچی وەهەب و خاتوو خەدیجەی کچی خوەیلد، بەڵکو لەوە خراپتریشیان ئەنجام دەدا کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکرد، تەنانەت هەیان بوو حەوت کچی زیندەبەچاڵ کردبوو!!

جا قورئان وێنەی ئەم حاڵەتەی بۆ کێشاوین: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ* يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلاَ سَاء مَا يَحْكُمُونَ﴾ (النحل / ٥٨-٥٩).

بەڵام پێغەمبەر هات و ئەو حاڵەتەی گۆڕی ئەوەتا دەربارەیان دەفەرموێت: (( هەرکەسێك سێ کچی هەبێت و جوان پەروەردەیان بکات ،زانستی دینداریو ڕەوشتیان فێربکات و، بەزەیی پیایاندا بێتەوە بەهەشت مسۆگەر دەکات )) .

لێیان پرسی ئەی ئەگەر دوکچی هەبێت، فەرموی ئەگەر دوانیشی هەبێت، لێیان پرسیەوە ئەگەر یەك كچیشی هەبێت، فەرمووی: ئەگەر یەك دانەشی هەبێت، ئەوسا زەردەخەنەیەكی كرد، ئینجا بەراوردێك بكەن لەو گۆڕانكاریەی كە لەژیانی عەرەبەكاندا لەپێش ئیسلام و لە دوای ئیسلامدا ڕویدا بەڕاستی ئەوسەروەرە ( رحمة للعالمین )) ە .

## شاری مەككە لەساتەوەختی پێغەمبەرایەتیدا:

تێڕوانینێكی هەڵەیە گەر بوترێ مەككە بریتیبوو لەبیابانێكی بێسەروبن و دابڕاو لەجیهان، بەڵكو ناوەندی بازرگانی جیهانی بوو، بازرگانی جیهانی بەناو مەككەدا تێدەپەڕی، كاتێك شمەكی بازرگانی لە وڵاتی چینەوە دەهات بۆ یەمەن و پاشان دەگەیشتە مەككەو لەوێوە تێپەڕی دەكرد بەرەو شام و ناوەندێك بوو بۆ بەیەك گەیشتنی بازرگانی فارس و ڕۆم و قورەیش... كەگواستنەوەی ئەو بازرگانیە جیهانیەیان بەدەستەوەبوو، هەربۆیە دەوڵەمەند بوون و بازرگانەكانیان لەدەوڵەمەندانی جیهانی ئەو سەردەمە بوون.

خەسڵەتێكی تریش وای كردبوو تایبەتمەندیەك بدا بەقورەیش ئەویش ئەوەبوو كە مەككە بەشارێكی ئاینی پیرۆز ناسرابوو، مەڵبەندێكی ئاینی بوو خەڵكی بۆ حەج ڕویان تێ دەكرد!! حەجیش وەرزی ڕۆشنبیری لەگەڵ خۆیدا دەهێنا ...

هەروەها قورەیش ناوەندێ بوو بۆ كۆڕە ڕۆشنبیریەكان كەوەك شوێنگەیەكی ڕاگەیاندنی بەناوبانگ، شاعیران لەهەموو لایەكی دورگەوە دەهاتنە ئەوێ ... هەروەها مەككە تاكە شوێنێك بوو كەتێیدا ئاسایش بەركەماڵ بوو، بۆیە خوای گەورە ئەو نیعمەتانەیان وەبیردەهێنێتەوە!

﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَماً آمِناً يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقاً مِن لَّدُنَّا وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ..﴾ (القصص/٥٧)

هەروەها شاری مەککە بنکەیەکی تێدابوو ناوی (دار الندوة) بوو، وەك پەرلەمانی قورەیش وابوو لەو شوێنەوە گەورەکانی قورەیش کۆدەبنەوە بۆ بڕیاردان لەسەر کێشە گرنگ و چارەنوس سازەکان ...

وەك ئاماژەمان پێدا ناو حەرەم ٣٦٠ بتی تێدابوو هەریەکێك لەو بتانە نوێنەری هۆزێك بوون، قورەیش ئەم سیاسەتەیان گرتووە بە بەمەبەستی پاراستنی بازرگانیەکەیان لەهەر پەلاماردانێك ... دیارە دەست گرتنی قورەیش بەبت پەرستیەوە هەر بۆمەبەستی ئابوری بوو، چونکە ئادەمیزاد لەناخیدا یەکتاپەرستە، ئەگەر ڕێگە بەناخی خۆی بدات ئەوا خوای تاك وتەنها دەپەرستێت، جا شەیتان لەمیانەی دەروازەی ئابورییەوە قورەیشی فریو دابوو، دەیانووت ئەگەر واز لەبتپەرستی بهێنین ئەوا هاوپەیمانیەتەکەمان لەگەڵ تیرەو هۆزەکاندا دەشێوێت، ئەوکات بازرگانیەکەیشمان خراپ دەبێت و پێشەوایەتیمان لەنێو دورگەدا دەکەوێتە بەرمەترسی ... کەواتە مەسەلەکە بەرژەوندیو دەسەڵاتە، ئەوان چاك دەیانزانی کەپێغەمبەر(ﷺ)ڕاستگۆیەو هەموو سیفەتێکی چاکەی تێدایە، تەنانەت جارێك (أبوجهل )بە پێغەمبەری ووت(ﷺ)کەخوا هیچ هاوەڵێکی نیەو تەنهایە ، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی بەڵێ... (أبو جهل) وتی: ئەگەر بزانم تۆ ڕاستگۆیت ئەبێ شوێنت بکەوم بەڵام ئەو نامەردە جورئەتی بەخۆیداو بەو ڕاستگۆ بەڕێزەی وت: تۆ درۆزنیت !!

بەڵام کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دورکەوتەوە، أبوجهل بەهاوڕێکەی تەنیشتی وت: من چاك دەزانم کەڕاستگۆیە، بەڵام ئێمەو (عبدالمناف) ململانێی یەکترمان

قبوڵ بو هەتا ئەوکاتەی ووتیان پێغەمبەریێتی هی ئێمەیە!! کەواتە مەسەلەکە پێشەوایەتیو دەسەڵاتە نەك شتێکی تر لەنێوەندی ئەو کەش وهەوایەو، لەنێو ئەو هەموو ئاستەنگەی لەنێو جیهان و دورگەی عەرەب و مەککەدا بوو پێغەمبەر(ﷺ) توانی بانگەوازی خۆی بگەیەنێتە هەموو جیهان، بارودۆخی ناهەمواری دەوروبەر نەیتوانی دوچاری نائومێدیو بیٚهیوایی بکات و پاشەکشەبکات، بەڵکو چاودێرییەکی وردی بارودۆخەکەی دەکردو دەرکی ئەو خاڵانەی دەکرد کەدەتوانێت سودیان لیٚوەربگرێت ئەوکاتەی کەشاری مەککە مەڵبەندێك بوو بۆ حەج، پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەوێوە هەوڵیدا بانگەوازی خۆی بڵاوبکاتەوە ... بەرهەمی ئەو هەوڵە درێژ خایەنە موسڵمان بوونی پشتیوانان بوو، دوای ئەوەی لەوەرزی حەجدا بانگی(کردن، بەدوای ئەمەدا کۆچ کردن روویدا ... هەروەها دەیزانی کەزمانی قورەیش زمانی پاراوی نێو عەرەبە بۆیە بۆ گەیاندنی بانگەوازەکەی بەکاری هێنا، بەدوور لەهەموو رِق ئەستوریەك.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) توانی سود لەخەسڵەتێکی تر وەربگرێت ئەویش ئەوە بوو کەعەرەبی دورگە ئازاد بوون و ژێردەستەی رۆم و عەجەم نەبوون. سەر شۆڕو پاشکۆ نەبوون، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) جەختی لەسەر ئەم مانایەکردەوە بۆ ئەنجامدانی راپەرِینەکەی ..

کەواتە پێویستە منداڵەکانمان لەسەر ئازادیو شانازی کردن بەخودەوە پەروەردەبکەین، ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بەهایانەی لەدەرونی هاوەڵانیدا بزواندو توانی رِوی مێژوو بگۆرِێت، جارێك پێغەمبەر(ﷺ) لەناو کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا ویستی ئاو بگێرِێت بەناویاندا، ویستی لەدەستی راستەوە دەست پیٚ بکات حەزرەتی عەلی یەکەم کەسی دەستی راست بوو لەو کاتەدا منداڵ بوو پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی لیٚکرد کەسەرەتا ئاوەکە بدات بەگەورەکان

حەزرەتی عەلیش فەرمووی بەشی خۆم لەدەستی موبارەکت نادەم بەکەسی تر پێغەمبەر (ﷺ) سەیرێکی هاوەڵانی کردو فەرمووی ئەمە مافی خۆیەتی.

بۆیە دەبێت لەدەرونی ئوممەت دا شانازی کردن بەخۆیانەوە بروێنین و ریسوابوون قبوڵ نەکەن هەتا گەل و ئوممەت سەر بڵندو سەرفراز بێت.

## ناوی (ﷺ) :

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ)لەدایك بوو باپیری ناوی‌نا محمد هۆکارەکەیان لێ پرسی وتی: حەزدەکەم لەلایەن خەڵکی سەرزەوی‌و ئاسمانیشەوە سوپاسکراوبێت .. لەناوەکانی(ﷺ) (أحمد)ە واتە لەهەمووکەس زیاتر سوپاس دەکرێت... لەبەر ئەمەیە دەفەرموێت(ﷺ)لەرۆژی قیامەتدا ئاڵای (حمد) بەدەست خۆمەوە دەبێت، هەر خۆیشی(ﷺ) لەژێر عەرشی پەروەردگاردا کرنوش دەبات و بەجۆرێك سوپاسی خوا دەکات، کەس لەوەو پێش نەیکردبێت ... هەموو ئەمانە لەبەرئەوەیە کۆتا پێغەمبەرە، کۆتا سەروەرە، کۆتا خەمخۆرە چونکە سوپاسگوزاری پەیوەندیەکی دەرونی پتەوی هەیە بەراپەڕین و هەڵسانەوەوە لەبەرئەوەی سوپاسگوزار هەمیشە هێورە، دڵنیایە، بەمتمانەیە ...

## نەژادی (ﷺ) :

بەداخەوە زۆربەی گەنجانی موسڵمان تەنها ناوی خۆی‌و باوکی‌و باپیری دەزانن، لەکاتێکدا گەنجانمان دەبینین ناوی گۆرانی بێژو یاریزانەکان بەخۆیان و باوکیانەوە دەزانن و زۆرێك لەچۆنیەتی ژیانیان شارەزان.

پێغەمبەر(ﷺ)ناوی (محمد)ە کوڕی (عبدالله) کوڕی (عبدالمطلب) کوڕی (هاشم) کوڕی (عبدالمناف) کە دوای چەند پشتێك دەگاتە (فهر) کەباوەگەورەی



قورەیشەو (دار الندوة)ی بنیات ناوەو یەکێکە لە کورەکانی (إسماعیل)کوڕی (إبراهیم) سلاوی خوایان لێ بێت ...

هاشمی باپیریشی کەڕۆیشت بۆلای ڕۆم و فارسەکان و لەگەڵیانا ڕێککەوت کەبازرگانی قورەیش بگاتە هەردوو دەوڵەتی فارس و ڕۆم هەروەها هاوپەیمانیەتی لەگەڵ هۆزەکاندا گرێدا.

(عبدالمطلب)ی باپیریشی کە بیری زەمزەمی بەشێوەیەك هەڵکەند کەبەشی عەرەب وحاجیان بکات ...

جاسەرنجی ئەو پێشەوایەتیو مرۆڤایەتیە بکە کەباووباپیری پێغەمبەر(ﷺ) هەڵگری بوون.

لەگەڵ ئەو نەژادو ڕەچەڵەکە بەرێزانەدا خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك دەوڵەمەندییان بەخۆیانەوە نەبینیوە، بۆیە خوای گەورە ئەو کەش و ژینگەیەی بۆ فەراهەم هێنا، تاتێیدا گەشەونش ونما بکات وفێری خاکیەتی هەژاران و عیزەتی دەوڵەمەندان ببێت ...

لەهێرشی (ئەبرەهە)دا بۆسەرمەککە ڕۆڵی( عبدالمطلب)و باوەڕی بەهێزی بە پەروەردگاری (بیت)ڕون و ئاشکرایە، هاوڕێ لەگەڵ خۆنەویستیو بەرخۆدانیدا.

(ئەبرەهە) بەداواکاریەکەی (عبدالمطلب) پێکەنیو وتی هاتوی بۆ داوای ماڵات ووشتر؟! من بۆ ڕماندنی کەعبە هاتووم باسی ناکەیت!! (عبدالمطلب) وتی: دڵنیابە کە(کعبە) پەروەردگارێکی هەیە دەیپارێزێت.

ئەوەی تێبینی کراوە عەرەب و(غەیرە عەرەبیش) ڕەچەڵەك و خزمایەتیان لەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەردا(ﷺ) هەیە، (کنانە)ی باپیری یەمەنیەو باپیری(إبراهیم) عێراقیو (هەندێکیش دەڵێن کوردستانی)یە داپیرەشی (هاجەرە) لەمیسرو خۆی لەمەککەو خاڵوانی لەمەدینەو هاشمی باپیری لە(غزە)ی فەلەستین

نەسپەردەکراوە بۆیە تا ئەمڕۆش پیّی دەوترێت (غزه)ی (هاشم) نەوەکانی لە (أردن) ژیاون (ام ایمنی) دایەنیشی لە سودان و (حلیمه السعدیه) لە گوند نشینانە، کاتێك ( محمد) کەوتە سکی دایکیەوە ئامینە ڕوناکیەکی بینی لە سکی هاتە دەرو گەیشتە خاکی شام ....

## مێژووی لەدایک بوونی (ﷺ) :

لەبەرەبەیانی ڕۆژی دوشەممەی (١٢ربیع الأول ) لەبەرامبەر ٢٠ی نیسانی ساڵی ٥٧٠ی زاینی بە پەنجا ڕۆژ دوای بەسەرهاتی فیل هاتە دنیاوە ....

ئەم ڕووداوە پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ) ڕویدا بۆیە قوڕەیش کە دەیانویست ڕاستیەکان بشێوێنن شکستیان هێنا چونکە خوای گەورە بە(معجزەیەك) فریای (کعبه) کەوت کەتەمەنداره‌کانی قوڕەیش بەچاوی خۆیان دیتبویان.

## شێوەو ڕوخساری (ﷺ) :

پێغەمبەر(ﷺ)باڵای نەدرێژ بوو نەکورت بەڵکو مام ناوەندی بوو ڕەنگی سوررو سپی بوو، قژو ڕیشی زۆر ڕەش بوون، ڕەنگە خوێنەر تاڕادەیەك بتوانێ ڕوخساری پیرۆزی بێنێتە بەرچاوی...

(عبدالله)ی کوڕی (سلامه)، کە یەکێك بوو لەزاناکانی جولەکە، کاتێك زانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتۆتە مەدینە بڕیاریدا بڕوات بۆلای تا چەند پرسیارێکی لێ بکات تا ڕاستگۆیی ئەو زاتە تاقی بکاتەوە ...

هەربەبینینی ڕوخساری پێغەمبەر(ﷺ) پرسیارەکانی لێنەکرد کاتێك (عبدالرحمن)ی کوڕی هۆکارەکەی پرسی، وتی: ئەو ڕوخسارە، ڕوخساری کەسێکی درۆزن نیە ...

(جابر) ی‌کوڕی (عبدالله) دەڵێت: لەشەوێکی مانگە شەودا بەناو مەدینەدا دەڕۆیشتم، لەوکاتەدا سەیری مانگم دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ڕوم هات بەراووردی مانگ و پێغەمبەری خوام(ﷺ)دەکرد سوێند بەخو ا ڕوخساری پێغەمبەر(ﷺ) زۆر جوانتر بوو لەڕوناکی مانگ.

کاتێکیش لە(عبدالله)ی کوڕی (ڕەواحە)ی شاعیری عەرەبیان پرسی دەربارەی ڕوخساری پێغەمبەر(ﷺ) وتی: کاتێك دەیبینیت دەڵێیت ئەوە خۆرە هەڵهات ... ئەم ووتەیەش پەیوەندی بەلەدایکبوونی پێغەمبەرەوەیە(ﷺ) چونکە لەساتی هەڵهاتنی خۆردا لەدایك بو ، کەواتە ئەگەر خۆر هەموو ڕۆژێك هەڵبێت ئەوا لەدایك بونی ئەو زاتە هەڵاتنێکە بۆ هەموو زەوی تارۆژی ڕەستاخێز.

**دایەنەکەی ( ﷺ) :**

منداڵی(ﷺ) قورەیش منداڵەکانی خۆیان دەنارده نێو بیابان هەتا لای دایەن شیر بخۆن و گەورەبن چونکە کەش وهەوای بیابان لەژینگەی ناوشار پاکترو فراوانتر بوو.. لەنێو بیاباندا هۆزێك دەژیان بەناوی(بنی سعد)، زۆربەی ئافرەتانی ئەو هۆزە دایەن بوون و شیریان دەدا، هەموساڵێك بەمەبەستی شیر پێدان و گەورەکردنی منداڵانی مەککە دەهاتنە ئەو شارەو دوای دووساڵ بۆیان دەگێڕانەوە ... هەرچەندە کرێی دایەنەکان کەم بوو بەڵام پشتیان بەو دیاری‌و بەخشیشانە دەبەست کە باوکی منداڵە شیر خۆرەکان پێیان دەدان، هەر لەبەر ئەمەش بوو دایەنەکان بەدوای منداڵێکدا دەگەڕان کەباوکی دەوڵەمەند بێت

کاتێك ئافرەتە دایەنەکان هاتنە ناو مەککە بۆ منداڵ زانییان منداڵێکی بێباوك هەیە، نەدەڕۆیشتن بۆلای لەبەرئەوەی کەسێکی دەوڵەمەندی وای نەبوو دیاری چاك و بەخششیان بداتێ ...

جاکاتێ هەموو دایەنەکان منداڵی خۆیان دەستکەوت جگە لەیەکێکیان کاتێك چاوی بەچاوە گەشەکانی گەورەی بونەوەر (محمد )ی کوڕی(عبدالله) (ﷺ) کەوت، خۆی پێنەگیرا، هەڵیگرت و تێر ماچی کردو تێر شیری کردو لەناخی خۆیدا بڕیاریدا ئەگەر زەرەریش بکات هەر بیبات.

(حلیمە )دەڵێت: هاتین بۆ مەککە هەر یەکێك لەئێمە کەباسی (محمد)ی بێباوکی دەبیست نەیدەویست، دەیانووت: دایکیوباپیری دەتوانن چیمان بدەنێ تا سەرەنجام هەموو هاوڕێکانم هەریەکەیان منداڵێکیان دەستکەوت منیش پێم خۆش نەبوو بێمنداڵ بگەڕێمەوە بۆیە ڕۆیشتم و هێنام، مێردەکەم پێی وتم : (حلیمە) بەخوا وای دەبینم بەشەکەمان شەماڵێکی پیرۆزە .

حەلیمە دەڵێت: هەرکە(محمد)م لەباوەش گرت، هەستم کرد هەردوو مەمکم پڕبون لەشیر، دەڵێت: هەتا گەڕاینەوە (بنی سعد) چەند جارێك سنگم پڕ بوە لەشیرو ئەویش تێری لێدەخوارد .... کاتێك هەڵسایین مێردەکەم پێی وتم : پێم نەوتی شەماڵ و شنەیەکی پیرۆزمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە.... ئەڵێت ئەو ساڵە ووشکە ساڵیبوو کاتێك ماڵاتمان لە لەوەڕگا دەگەڕانەوە ئەوەندە شیریان نەبوو تێری لێ بخۆیتەوە، بەڵام ماڵاتەکەی من کەدەچون تێر لەوەڕ دەبوون و بەگوانی پڕەوە دەگەڕانەوە بەجۆرێك شوانەکانی (بنی سعد) دەیانوت: ماڵاتەکانتان بەدوای ماڵاتەکەی حەلیمەدا بنێرن بۆ لەوەڕ ...

دوو ساڵ لای مایەوە، دەڵێت: بەقەد منداڵێکی گەورە نەش و نمای کرد ...



**وەفاو ئەمەکناسیەکی بێ وێنە :**

دوای ئەوەی خوای گەورە منەتی ڕزگارکردنی مەککەی بەخشی بەموسوڵمانان پیرەژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)سەیری دەکردو زەردەخەنەی دەکرد پێغەمبەر(ﷺ)پرسیاری کرد ووتیان ئەوە (حلیمە)یە دایەنی بەڕێزتان، ڕوخساری پێغەمبەر(ﷺ)لەخۆشیدا درەوشایەوە بۆیە فەرمووی دایەگیان وەرە، وەرە دایەگیان، پاشان لەپاڵیا دانیشت و بەخەڵکەکەی فەرموو ڕێگەم بدەن ماوەیەك لەگەڵ دایکمدا دانیشم ...

دوای جەنگی حونەین و سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر هۆزی هەوازندا موسوڵمانان دەستکەوت و دیلێکی زۆریان چنگ کەوت، لەنێو دیلەکاندا (شیماء)ی خوشکی شیری تێدابوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)هاوەڵانی کۆکردەوەو فەرموی: پێتان چۆنە دیلەکان ئازاد بکەین !!

وتیان کێیان تێدایە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟! فەرمووی:( شیماء )ی خوشکی شیریم، وتیان: دەیناسیتەوە؟ فەرمووی: نەخێر بەڵام وەك ئەمەکێك بۆ (حلیمە)ی دایکم ... جا هەندێك دیلەکانی خۆیان ئازاد کردو هەندێکیشیان ڕازی نەبوون، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)پارەی بۆ پەیداکردکردن و ئازادی‌کردن....

**بێ دایك وباوكی لەژیانی پێغەمبەردا ( ﷺ ) :**

چەند مانگێك دوای هاوسەرگیریان، (عبدالله) بەمەبەستی بازرگانی بەرەو شام كەوتەڕێ، لەو ڕۆژانەدا خاتو(آمنة) دووگیان بوو بەسەرداری بونەوەر(ﷺ)، لەكاتی گەڕانەوەیدا سەردانی ماڵە خاڵوانی كرد لەمەدینە، ئەوە بوو لەوێ نەخۆش كەوت هەر لەوێ ئازارو نەخۆشیەكەی زیادی كردو بەو هۆیەوە گیانی لەدەستداو هەر لەمەدینە ئەسپەردەكرا ... دیارە بەرزترین حاڵەتی هەتیوی ئەوەیە باوك بمرێت و كوڕەكەی لەسكی دایكیدا بێت بۆیە ئامێزی باوكی بەخۆیەوە نەدی‌و لەسۆزو خۆشەویستی باوكی بێبەش بوو، ووشەی باوكە بەسەر زمانیدا نەهات، لەگەڵ ئەوەشدا سۆزی خۆی دەدا بەهەموو گەنج و لاوێك و بەهاوەڵانی دەوت من وەك باوكتان وام ...

لەوانەیە باشترین بەڵگەی ڕاستی ئەوەی وتمان ئەو پێشوازیە بوو كە لە(زید)ی كوڕی(حارثة)ی كرد كاتێك لەسەفەر گەڕایەوە، لەوكاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەكەی خۆیدا بوو پۆشاكی ماڵەوەی لەبەردابوو كاتێك (زید)لە دەرگایدا زۆر بەخێرایی هاتەدەر بێئەوەی خۆی كۆبكاتەوە ئامێزی بۆكردەوەو نێو چەوانی ماچ كرد ...

كاتێك هەندێك لەكچۆڵەی پشتیوانان هاتن و كەوتنە گۆرانی وتن ووتیان

ئێمە كچانی (بنی نجارین ) خۆزگە بەدراوسێكانت ئەی (محمد )

پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسین منتان خۆش دەوێت؟ !!

وتیان: بەڵێ ... ئەویش سەری دەخستنە نێوان هەردوو شانی‌و دەیفەرموو خوا دەزانێت بەدڵ ئێوەم خۆش دەوێت .



کاتێك تەمەنی گەیشتە ٦ساڵی هەر لە ئامێزی دایکیدا دەژیا(ﷺ) دایکی بڕیاریدا بڕوات بۆ مەدینە تا سەردانی گۆڕی باوکی بکات و خزمان بەسەربکاتەوە،ئەوەبوو لەگەڵ دایکیو (أم أيمن )دا ڕۆیشت –کە کەنیزەکێکی سودانی بوو –لەکاتی گەڕانەوەیاندا بەرەو مەککە، دایکی دوچاری نەخۆشیەکی زۆر بە ئازار بوو تا دەهات ئێش و ئازاری نەخۆشیەکەی زیادی دەکرد سەرەنجام لەبیاباندا لەجێگەیەکدا بەناوی (الأبواء) کە ١٥٠کم لەشاری مەدینەوە دورە کۆچی دوایی‌کردو (ام أيمن) هەر لەوشوێنەدا بەخاکی سپارد پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دیمەنەی هەمیشە لەیاد بوو هەتا ئەوکاتەی کەبەرەو ڕزگارکردنی مەککە دەڕۆیشتن فەرمانی کرد لەوێ لەسەر گۆڕی دایکی وەستاو دەستی کرد بەگریان و ئەوەی لەو ناوەدا بوو هەموویانی هێنایە گریان.

ئەمەش کە بەژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) گوزەری کرد بۆ ئامادەسازی‌بوو هەتا پێشەوایەتی مرۆڤایەتی بەڕێوەبەرێت... لەبەرئەوەی مرۆڤایەتی بەڕێوەدەبات ئەبێ دنیا ویست نەبێت، جا ئەم نارەحەتیانەی لەمیانەی منداڵێدا بەسەر هات وای لێ‌کرد حەیقیقەتی ژیانی بۆ دەرکەوێت، ئەوەتا ئێستا دوای ئەوەی بۆتە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: من چیم داوە لەم دنیایە، نمونەی من ودنیا وەك ئەو ڕێبوارە وایە لەڕۆژێکی زۆر گەرمدا ڕێی دەکەوێتە دارێك بۆ پشودان لەژێر سێبەری ئەو دارەدا کەمێك دەحەوێتەوەو پاشان جێی دێلێت، ئەوەتا بەخشینی بەخۆڕێکە کە هەرگیز لەهەژاری ناترسێ، دوای ئەوەی دەسکەوتی جەنگی کەوتە دەست پڕی شیوێك مەڕو ماڵاتی هەبوو ئەعرابیەك هاتە خزمەتیو لێی پرسی: ئەو هەمووە هی خۆتە ! فەرمووی(ﷺ) : بەڵێ پاشان، فەرمووی: حەزت لێیەتی؟! کابرا: ووتی: بەڵێ، فەرمووی(ﷺ) هەموویان بۆ تۆ ... کابرای عەرەب ووتی: گاڵتەم پێ دەکەیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر.

کابرا هەمووی بردو گەڕایەوە ناو هۆزەکەی‌و دەیوت! لەلای باشترین کەسەوە هاتومەتەوە لاتان، محمد بەجۆرێك دەبەخشێت لەهەژاری ناترسێت.

پێغەمبەر(ﷺ) و(ام أيمن) گەڕانەوە مەککە، دوای ئەمە دوو ساڵ لای (عبدالمطلب)ی باپیری مایەوە، پاشان سێیەم جار هەتیو کەوتەوەو (عبدالمطلب)ی باپیریشی کۆچی دوایی‌کرد .. بەدوای ماڵی باپیریدا گواستیانەوە بۆ ماڵی (ابو طالب)ی مامی ...

لەوانەیە ئەوەی بەم ئەزمونە تاڵ و ڕەقانەدا ژیانی تێپەڕێت کەسێکی کەم بەزەیی‌و تورەو دەرون نەخۆش دەرچێت، هەرئەمەیشە هەندێ لەڕۆژهەلاتناسان هەوڵیان داوە بیلکێنن بەپێغەمبەرەوە(ﷺ)... بەمەرجێ هەرگیز مێژووی مرۆڤایەتی کەسێکی بەسۆزتری وەکو پێغەمبەری(ﷺ) بەخۆیەوە نەبینیوە. لەجەنگی (أحد)دا کەوتە چاڵێکەوە، یەکێك لەبێباوەڕان بە شمشێرەکەی دای بەکلاوەکەی سەریداو دوو دانی پێشەوەی شکاندو خوێن بەدەم وچاوی پیرۆزیدا هاتەخوار، کاتێك هاوەڵان داوایان لێ‌کرد دوعا لەو ستەمکارانە بکات، فەرمووی: من نەهاتووم نەفرین لەخەڵکی بکەم بەڵکو نێردراوم هەتا ڕەحمەت بم و ڕێنماییان بکەم، ئینجا دەستەکانی بەرزکردەوەو فەرمووی: خوایە لەگەڵەکەم خۆش ببە ئەوان نەفام و نەزانن.

بەڵکو لەوە زیاتر دوای ئەوەی لەلایەن خەڵکی طائفەوە چی بەسەرنەهات خوای گەورە فریشتەی کێوەکانی ناردوو فەرموی: گەر بتەوێت ئەو دوو کێوەیان لێ‌دەهێنمەوە یەك، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)ڕازی نەبوو، بۆیە فریشتەی کێوەکان فەرمووی: ڕاستی فەرمووە ئەو کەسەی ناوی ناویت( رؤوف رحيم ) .

(أنس)ی کوڕی (مالك ) ئەڵێت: کەسم نەدیوە بەقەد پێغەمبەر (ﷺ)بۆ منداڵ بەسۆز بێت ...

ڕۆژێك (عمیر)ی برای (انس)ی کوڕی (مالیك)ی خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ)کەمنداڵ بوو لەگەڵ چۆلەکەیەکی بچوکدا یاری دەکرد، ناوی چۆلەکەکە (نغیر) بوو ... هەر جارێ کە پێغەمبەر(ﷺ) (عُمیر)دەبینی پێی دەفەرموو: (عُمیر) (نغیر) چی دەکات ؟!

ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) (عُمیر)ی بینی ئەگری لێی پرسی بۆچی ئەگریت؟ ووتی: (نغیر)مرد...پێغەمبەر(ﷺ) (عُمیر)ی کردە باوەشیو لەنێو کوچەوکۆڵانەکانی مەدینەدا کەوتە یاریکردن بۆی، چەند هاوەڵێك کەپێغەمبەریان بینی لێیان پرسی: ئەوە چی ئەکەیت؟ فەرمووی: (نغیر) مردووە یاری بۆ (عمیر) دەکەم، هەر بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو بۆ ڕۆژی دوایی ( ﷺ) چوو بۆ ماڵی (عمیر)و سەرخۆشی لێکرد ...

پێش ئەوەی(عبدالمطلب) بمرێ وەسێتی بۆ(أبو طالب )ی کوڕی کرد کەچاودێری (محمد) بکات، مامیشی دە منداڵی هەبوو، دیارو ئاشکرایە بوونی دە منداڵ لەماڵێکدا لەگەڵ کەمدەستیدا واتای چی دەگەیەنێت .. هەموو ئەمانە بۆ ئامادەکردنی پێغەمبەر( ﷺ) بوو هەربۆیە دەیفەرموو: خوای گەورە بەجوانترین شێوە پەروەردەی کردوم.

لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بە خاڵێکی زۆر گرنگ بکەم: هەمیشە (محمدﷺ) لەناوەڕاستی ئازارەکاندا کەسێکی دەست دەکەوت لەئامێزی گەرمی بنێ، لەبەرئەوە نابێت بەو شێوەیە سەیری ڕوداوە دڵتەزێنەکانی ژیانمان بکەین و سەری دنیامان لێ بێتەوەیەك: خوای گەورە زۆر جار شتێك لەئادەمیزاد وەردەگرێتەوە هەتا شتێکی تری بداتێ ..



پێغەمبەران، هەموویان دوچاری نارەحەتی بوون، لەوەودوا خوای گەورە دەروی لێکردونەتەوە، ئەوەتە حەزرەتی نوح دوای ئەوەی ئازاریانداو گاڵتەیان پیکرد، بەکەشتیەك ڕزگاری کردو دوژمنانی لەزریانەکەدا نوقم کرد، (إبراهیم)یش سلاوی خوای لێبێت دوای ئەوەی فڕێدرایە ئاگرەوە بووە هاوڕێی پەروەردگاری، (یعقوب) پێغەمبەریش ئەوەندە گریا بۆ(یوسف)ی لاو و جوانخاسی سایی لەدەستدا، کەچی (یوسف) بەویستی خوا چاوەکانی بۆ دەگێڕێتەوەو دوای سالەها بەیەك شاد دەبنەوە، (موسا) پێغەمبەریش دوای ئەوەی بەترس و لەرزەوە لە(مصر) دەرچوو بەلام بەسەرکەووتویی دەگەڕێتەوەو لەو ڕێڕەوەدا گفتوگۆ لەگەڵ زاتی پەروەردگاردا دەکات ـ (عیسا) پێغەمبەریش خۆیو دایکی بەکاری حراپ تۆمەتبارکران کەچی پاش چەند ڕۆژێك ئەبێتە موعجیزەیەك شایەتی بۆ پاکیی دایکی دەدا ... لەکۆتاییدا گەورەی مرۆڤەکان (محمد ﷺ) دوای ئەوەی بەبێدایك و باوك لەمەککەدا ژیا، دوای ئەوەی کۆچی کردو بەجێی هێشت و، پێیان کرد کەچی پاش چەند ساڵێك بەسەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە ناویان و پێیان دەفەرموێت بڕۆن هەموتان ئازادن ...

پێغەمبەر(ﷺ)هەتا تەمەنی گەیشتە ٢٥ ساڵی لەماڵی (أبو طالب )ی مامیدا مایەوە، لەوماوەیەدا ڕازی نەبوو بارێکی قورس بێ بەسەر مامیەوە، ئەو هەر لەتەمەنی ٨ ساڵییەوە شوانی بەرغەلی دەکرد ... بەهۆی شوانیەتیەوە فێری ئارامیو هێوریو پێشەوایەتی بوو ....

ئەم کارەشی تا تەمەنی ١٥ ساڵی بەردەوام بوو بۆیە دوای ئەو تەمەنە داوای لە(أبو طالب)ی مامی کرد لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ بازرگانی بۆشام، پاشان ماوەی ٢٠ ساڵ سەرقاڵی بازرگانی کردن بوو تا تەمەنی گەیشتە ٣٥ ساڵ، کاتێ

تەمەنی ١٥ ساڵ بوو بەشداری کرد لەجەنگی (الفجار)دا کە سێ ساڵی خایاند لەوێوە فێری هونەری جەنگ بوو، پاشان لەپەیماننامەی (الفضول)دا بەشداری کرد، بەمەش پێغەمبەر(ﷺ) توانی فێری پێشەوایەتی کردن و ئابوری ناسیو جەنگ و سیاسەت بێت، دیارە هەموو ئەو ‌بارودۆخانەی کەپیایدا تێپەڕی، بۆ ئامادەکردنی بۆ پێغەمبەرایەتیو ڕابەرایەتیو پێشەوایەتی بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) لەمیانەی بەشداری کردنی لەزۆربەی بوارەکانی کارو تێکەڵ بون بەکۆمەڵگەکەیدا، ئەزمونی باشی بەدەست هێنا تا ئامادەبێت بۆ سەرکردایەتی کردنی مرۆڤایەتی، ئەو ئەزمونانە بەتێکەڵ بوونی بەکۆمەڵگا جیاوازەکانی تر تەواو بوو کەجیاوازبوون لەو ژینگەیەی خۆی، کاتێك تەمەنی گەیشتە ٢٥ ساڵ ئەزمونێکی نوێی تێپەڕاند ئەویش سەفەرکردن بوو بۆ بازرگانی ...

سەفەرکردن ئەزمونێکی گرنگە لەژیانی هەر ئادەمیزادێکدا، ئەویش بەو تێکەڵیەی کەلەمیانەی ئەو سەفەرانەوە بۆی دروست دەبێ لەگەڵ کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا، سەرەنجام شارەزای هەڵس وکەوت و نەریتیان دەبێت... کەواتە سەفەر ئەزمونێکی کەم وێنە دەبەخشێتە هەر کەسێك ....

بەڵێ دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) تەمەنی گەیشتە ٢٥ ساڵی لای خاتو خەدیجە کەوتە کارکردن و بازرگانیەکەی بۆ بەڕێوە دەبرد.... زۆرجاریش بازرگانیەکەی بەرەو شام دەبرد کە لەوکاتەدا لەژێر دەسەڵاتی ڕۆمەکاندا بوو ..

خاتو خەدیجە ئافرەتێکی زۆر زیرەك بوو، بازرگانێکی کارامە بوو تەمەنی ٤٠ ساڵ بوو دوای دوو پیاو بێوەژن کەوتبوو، بەهۆی ئەو ئەزمونە دوورودرێژەی



هەبوو لەبوواری بازرگانیدا ویستی پێغەمبەر(ﷺ) بەبازرگانیەکی بچوك تاقی بکاتەوە ئەوەبوو مەیسەرەی خزمەتکاری لەگەڵدا نارد ....

پێغەمبەر(ﷺ) سێ کاروانی لەنێوان مەکەو شامدا لەگەڵ مەیسەرەدا بەناکام گەیاند.

لەگەڕانەوەیاندا مەیسەرە هەر باسی دەسپاکیو ئەمینداریو دڵسۆزیو راستگۆییو لێبڕانی بۆ کارەکەی بۆ خاتو خەدیجە باس دەکرد .... هەروەها وتی (محمد) لەو سەفەرانەدا کڕنوشی بۆ هیچ بتێك نەبردووە، خاتو خەدیجەیش کڕنوشی نەبردبوو بۆ هیچ بتێك، ڕۆژێك مەیسەرە ئاگای لێبوو لەمامەڵەیەکدا بازرگانێك بە پێغەمبەری(ﷺ) وت سوێند دەخۆی بە(لات وعوزا)؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی هەرگیز نەم پەرستون تا سوێندیان پێ بخۆم ...کاتێك خاتوو خەدیجە ئەم کردەوە جوانانەی لێبیست بڕیاریدا ئەمجارەیان بەبازرگانییەکی گەورەوە بینێرێت بۆ شام، (محمد)یش(ﷺ) بازرگانیەکەی بەچاکی بەئەنجام گەیاندو پێش ئەوەی بگاتە شام شمەك و کاڵاکانی فرۆشت و قازانجێکی باشی مسۆگەرکرد ...

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) سەرکەوتنی بەدەست هێنا، خاتوو خەدیجە ئەوەندەی تر پێغەمبەری لاخۆشەویست بوو بەتایبەت چونکە دوور لەفێڵ و دەستبڕین و سوێندی ناحەق بەدەستی هێنابوو جگە لەڕەوشتە جوان و بەرزەکانی تری کە (میسرە) باسی کردبوو ئەوەش ئامادەسازییەکی خوایی بوو بۆ هاوسەرگیری.

خاتوو خدیجە لەمیانەی ئەو بازرگانیەی کەئەنجامیدا لەگەڵ چەندین جۆر لەخەڵکی مامەڵەی کردبوو..... بەڵام کاتێك مامەڵەی (محمد)ی بینی سەری سوڕما لەڕەوشتی بەرزی .

ئەوسا خاتوو خدیجە لای بەڕێزترین هاوڕێی کە(نفیسە)ی کچی (المنبە) بوو باسی گەورەیی‌و بەرزی ڕەوشتی (محمد)ی(ﷺ) کرد، (نفیسە) بەخاتوو (خەدیجە)ی وت: حەز دەکەیت من ئەو باسەی بەشێوازێکی حەکیمانە لەگەڵدا دەکەمەوە!!

خاتوو خەدیجە فەرمووی: زۆر چاکە .

ئەم هەڵوێستە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی ئەکرێت ئافرەت کەسێك بۆ خۆی دیاری بکات تابیکاتە هاوسەری ژیانی، بەتایبەت کاتێك بەشێوازێکی حەکیمانەو داناپانە بێت لەڕێزو مەکانەتی کەم نەکاتەوە ....

خاتوو (نفیسە) چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و فەرمووی: ئەی محمد ژنت هێناوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر، (نفیسە) وتی: بۆ چی؟! فەرمووی: کێ شوو بەهەژارێکی وەك من دەکات! خاتوو (نفیسە) وتی: ئەگەر تۆ ڕازی بیت من هەوڵ دەدەم کەخاتوو خدیجە شوو بەتۆ بکات ....، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جا ڕازی دەبێت؟.. خاتوو(نفیسە) وتی: من قسەی لەگەڵدا دەکەم .. ئەوە بوو چووە خزمەت خاتوو خەدیجەو گفتوگۆکەی نێوانیانی بۆ گێڕایەوە، خاتوو خەدیجە فەرمووی: بۆ کەس هەیە وەك (محمد) بێت ، دوای دوو ڕۆژ خاتوو (نفیسە) گەڕایەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)...لەگەڵ ئەوەدا جیاوازیەکی زۆر لەهەردوو ڕووی تەمەن و ماددیدا لەنێوانیاندا هەبوو، ژیانی هاوسەرداریان نمونەیی بوو، بەڵکو بەسەرهاتی خۆشەویستیەك بوو، مێژوو وێنەی وای بەخۆیەوە نەدیوە، بەجۆرێك پێغەمبەر(ﷺ)لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا دوای بیست



ساڵ پیرەژنێك هاتە خزمەتی لەگەڵ ئەو هەموو سەرقاڵیەی هەیبوو لەوڕۆژەدا کەوتنە قسەکردن لەگەڵ یەکدا کاتێك خاتوو عائیشە پرسیاری ئەو پیرەژنەی کرد؟ فەرمووی:( ﷺ) ئەوە هاوڕێی (خدیجە) بوو .... خاتوو عائیشە پرسی: باسی چیتان دەکرد؟ فەرمووی: یادی ڕۆژانی ڕابردووا!!

ڕۆژێك لەدەرگایماڵیان درا، گوێی لەشێوەی لێدانەکەبوو کە لەشێوەی لەدەرگادانی خاتوو(خدیجە) دەچوو، فەرمووی: دەڵێی دەنگی (خەدیجە)یە، خوایە، (هالە)ی خوشکی بێت، کاتێ دەرگاکەی کردەوە خاتوو(هالە) بوو ... سەیری ئەو ئەمەکداریە بکەن کەبۆ خاتو(خدیجە) هەیبوو (خوا لە هەموویان ڕازی بێت).

٢٥ ساڵ ژیانی هاوسەرداریو خێزانییان بەردەوام بوو بێئەوەی پەیوەندی پاك و بێگەردییان لیخن بێت، هەرچەندە هەردوو کوڕەکەی (قاسم وعبدالله) کۆچی دواییان کردو ئەزمونە تاڵەکان هەردووبارە دەبوونەوە هەتا ڕاستی ئەم ژیانەی بۆ دەرکەوێت کەیەکسانە بەهیچ. بۆیە بەمامی فەرموو: سوێند بەخوا مامە گەر خۆر لەسەر شانی ڕاستم، مانگیش لەسەرشانی چەپم دابنێن تاواز لەم کارە بێنم ... وازی لێناهێنم هەتا یان خوا سەریدەخات یا لەپێناویا تیادەچم!! .. مردنی منداڵەکانی ئەم مانایەی لا چەسپاند کە : دنیا بە دڵنیاییەوە کورت و کۆتایەو باش وایە هەر بۆ پەیامی خوا بژیو لەپێناوی هەڵسانەوەو بوژاندنەوەی مرۆڤایەتیدا بۆ دەستەبەرکردنی بەختەوەریان لەهەردوو جیهاندا بەهیچ شێوەیەك کەمتەرخەمی نەکات.



لەڕاستیدا ژیانی هاوسەرداریی، پێغەمبەر(ﷺ) ژیانێکی نمونەیی بێ کێشەو ئالۆزی بوو، ئەمەش سەرکەوتنی ژیانی کردەیی (عملی) ئەم زاتە دەگەیەنێت لەگەڵ خزم وکەس وکاردا هەموو چین و توێژەکاندا.



**رحمة للعالمين :**

هەموو ئەو ئەزموونانەی لەپێشەوە باسمان کرد ئامانجەکەی ئامادەکردنی، پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ هەڵگرتنی ئەم پەیامە بۆ هەموو جیهان، هەتا پێغەمبەر(ﷺ) ببێتە ڕەحمەت و ڕێنمویی تەواو ... کەواتە ئەبێ بەچەند ئەزمونێکی مرۆییدا تێپەڕێت هەتا بیسەلمێنێت کەبەکردەوە ڕەحمەتە بەتایبەت بۆ مرۆڤایەتی لەهەموو زەمان و زەمینێکدا.

دیارە ئەم ئەزمونانە دەبێت پێش بەپێغەمبەر بوونی بەدەستی بێنێت، چونکە لەبەرئەوەی ئەگەر دواتر بێت هەربۆ شوێنکەوتوانی دەبێت،بەڵام پێش پێغەمبەرایەتی هەر بەئەزمونێکی مرۆیی دەدرێتە قەڵەم ... ئەمەش ئاماژەیەکی جوانە بۆ ئەو ڕاستیەی کەئادەمیزادی موسڵمان پێویستە چاك بزانێت کە دەبێت خێرو بێری بۆ سەرجەم ئادەمیزادەکان هەبێت نەك تەنها بۆ موسڵمانان یان تەنها بۆ دیندارەکان، بێگومان قورئانیش هاندەرمانە بۆ ئەو هەڵوێستە: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً...﴾، ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾؟! .

بەسەرهاتەکەی (زید)ی‌کوڕی(حارثة)ش بەڵگەیە لەسەر مرۆڤ دۆستی، پێغەمبەر(ﷺ)، (زید)کوڕی(حارثة) کەمنداڵێکی تەمەن ٨ساڵان بوو لەگەڵ کاروانێکدا، لەناکاو هێرش کرایە سەریان و تاڵانفرۆشیان کرد سەرجەمیان کەوتە دەست (حکیم)ی کوڕی(حزام)ی کوڕی(خویلد) کەبرازای خاتوو خەدیجە بوو، ئەویش وەك دیارییەك بەخشی بەخاتوو خەدیجە، خاتوو خەدیجەش پێشکەشی کرد بەپێغەمبەر(ﷺ)، زەید لەگەڵ پێغەمبەردا ژیاو خزمەتی دەکرد... لەوکاتەدا باوکی زەید عەوداڵ بوو بەدوای کوڕەکەیدا، هەموو دورگەی عەرەب گەڕا بەدوایدا... تا زانی لای (محمد)ی کوڕی (عبدالله)یە،(ﷺ) ... ئەویش



لەگەڵ برایەکیدا رۆیشتە خزمەت، پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت: هاتووین بۆلای بەرێزتان بۆ کورەکەم ...

فەرمووی (ﷺ) کام؟

وتیان: زەیدی کوری حارثة!

فەرمووی: چیەتی؟

وتیان: ئێوە نەوەی (عبدالمطلب) کۆمەکی لێقەوماوان دەکەن، برسی تێردەکەن، پارەیەکمان بۆ کۆکردۆتەوە کە لەوە زیاتر ناهێنێت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: رایەکی باشتر هەیە !!

وتیان: چی‌یە؟

فەرمووی: خۆی ئازاد دەکەین ئەگەر ئێوەی هەڵبژارد ئەوا هی خۆتانەو (پارەو سامانیشم ) ناوێت ئەگەر منیشی هەڵبژارد ئەوا لەگەڵ هەڵبژاردنی ئەودا دەبم !

لەحاڵەتێکدا دەبوا بفەرموێت کوری خۆتانەو بیبەنەوە، ئەگەر وەك پەیوەندی بەندەیەك بەخاوەنەکەیەوە باس بکەیت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەستی بەئاستی وابەستە بوونی(زید) دەکرد بەخۆیەوە بۆیە مافی هەڵبژاردنی پێدا، لەبەرئەوەی هەرجۆرە هەڵوێستێك جگە لەوە (زید)ی ئازار دەدا ...

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تێگەیشتنی قوڵی پێغەمبەر(ﷺ) لە دەروونەکان.. بەم کارەشی چووە لوتکەی رێزگرتن لەئازادی مرۆڤەکان ....

(زەید) هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەمانە دەناسی؟

وتی: بەڵێ، باوکم و مامەمە ... سڵاوی لێکردن و دەستی کردە گەردنیان ...



پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زەید)، تۆ ئازادیت ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ باوکت و مامتا بڕۆیت، یان لای من بمێنیتەوە!!

(زەید) خێرا بێدوودڵی وتی: جگە لە تۆ لای کەسی تر نابم، هەتا لەژیاندا بم هەر لای بەڕێزتان دەبم !

باوکیو مامی ووتیان: (زەید) ئەوە تۆ دەڵێی چی بەندایەتی هەڵدەبژێریت بەسەر باوکت و مامت دا!!

(زەید) ووتی:سۆزو ڕەحمەتێکم بینیوە لەم پیاوە هەموودنیاو ئەوەی تیایەتی ناگاتە ئاستی ....

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی لە(زەید) بینی لەگەڵ خۆیدا بردیو ڕۆیشتن بۆ ناو حەرەم لەبەردەم قوڕەیشدا دەستەکانی بەرزکردەوەو فەرمووی: ئەی خەڵکی قوڕەیش، لەمڕۆوە (زەید) کوڕی منە، ئەمە (زەید)ی کوڕی (محمد)ە ...

هەموو ئەمانە پێش پێغەمبەرایەتی بووە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مرۆڤ دۆستی ئەو زاتە، بەڵێ (محمد)(ﷺ) وەك بازرگانێك سەرکەوتنی بەدەست هێنا، وەك باوکێك، وەك ئادەمیزادێك، وەك هەژار، وەك دەوڵەمەند، لەمامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکی جۆراوجۆردا ... دوا ئەزمون مایەوە کە دەبوایە ببینیایە هەتا ببێتە شاهید بۆی لەناو قوڕەیشدا، بۆ ئەوەی کاتێك بووە پێغەمبەرو بەدرۆیان خستەوە ببێتە بەڵگەو شایەت بەسەریانەوە، ئەویش ئەزمونی پێشەوایەتیو بەڕێوەبردن و چارەسەری قەیران وگیروگرفتە گەورەکان بوو ..



**قەیرانێکی ئاڵۆز:**

کاتێك(ﷺ) تەمەنی گەیشتە ٣٥ ساڵ قورەیش بڕیاری بنیاتنانەوەی کەعبەیاندا، دوای ئەوەی لافاو زیانی لێدابوو، سەرەتا قورەیش دوودڵ بوو لەدروستکردنەوەی نەبادا پەروەردگاریان لێ برەنجێ لەدوای مەشورەت و پرس وڕا بڕیاریاندا دەست بکەن بەڕوخاندی کەعبە بەمەبەستی سەرلەنوێ دروستکردنەوەی بەشێوازێکی مەحکەم تاجارێکی تر نەڕوخێتەوە، هەروەها پارەی حەڵاڵیشی تیادا خەرج بکەن ..

بێگومان قورەیش بنیاتنانەوەی کەعبەی بەشەرەفێکی گەورە دەزانی لەبەرئەوە هەرلایەکی درایە دەست هۆزێك هەتا گەیشتنە سەردانانی بەردە ڕەشەکە، لەوێدا ڕای جیاوازو دوبەرەکی دروست بوو لەسەر ئەوەی کێ ئەو شەرەفە گەورەیە بەدەست بهێنێت کار گەیشتە ئاستێك خەریکبوو جەنگێکی گەورەی لێبەرپا ببێت، تا سێ ڕۆژ ئیش کردن وەستا ...

دوای ئەوە (ولید) ی کوڕی (مغیرە) پێشنیاری کرد هەرکە لە(صفا)وە یەکەم کەس هاتە نێو حەرەم بیکەنە داوەری خۆتان، ئەوسا هەموویان بەو پێشنیارە ڕازی بوون، کاتێك(محمد (ﷺ)) هاتە ناو حەرەم، هەموو وتیان: ئەمین و ڕاستگۆکە هات هەمومان پێی ڕازین ...

ئەوسا ئەو زاتە پێشنیاری کرد، پارچە قوماشێك بێنن و بەردەڕەشەکەی بخەنە سەر، پاشان سەرۆکی هەر هۆزێك چمکێکی قوماشەکە بگرێت و هەموو لەیەك کاتدا بەرزی بکەنەوە بۆ ئاستی خۆی ئەوسا (محمد(ﷺ)) بەدەستە پیرۆزەکانی بەردەکەی خستە جێگەی خۆی!!



## خواپەرستی لەنێو ئەشکەوتدا :

خوای گەورە پێغەمبەری ئامادەکرد بۆ هەڵگرتنی پەیامەکەی، هەموو ئەزمون و تاقیکردنەوەکانی وەك بواری خێزانی، ڕەوشتی، مرۆیی، سیاسی، سەربازی .. هەر بۆ ئەو مەبەستەبوو، بەڵام لەئەستۆگرتنی پەیامی خوا زۆر قورسترە لەوەی مرۆڤێکی ئاسایی بتوانێت لەئەستۆی بگرێت، کەواتە دابەزینی قورئانیش بۆ سەر دڵی پیاوێك باسێکە نابێ بەکەم بزانرێت ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾(الحشر /٢١).

ئەمەش مانای وایە ئەو دڵەی کەتوانای هەڵگرتنی پەیامی خوای هەیە ئەبێت لەکێوەکان پتەوتر بێت ... کەواتە پێویستە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئامادە بکرێت بۆ ئەو ئەرکە مەزنە.

## سڵاوکردنی درەخت و بەرد:

یەکەم شتێك کەبەسەر پێغەمبەردا هات(ﷺ) سڵاوکردنی بەردو درەخت بوو... دارو بەرد پێیان دەوت (السلام عليك يا رسول الله)، ئەویش سەرسام دەبوو، وەڵامی دەدانەوە، دوای ساڵەها دەیفەرموو: بەردێك لەمەککە دەناسم پێش پێغەمبەرایەتیم هەمیشە سڵاوی لێ دەکردم !!

## خەونی ڕاست ودروست :

بەسەرهاتی دووەم کە لەنیشانەکانی پێغەمبەرایەتیە خەون بینینی ڕاستە پێغەمبەر (ﷺ) وەکو ڕۆژی ڕوناك خەونەکانی دەهاتنەدی دەربارەی خەون بینین دەفەرموێت:ﷺ) خەوبینینی ڕاست بەشێکە لە٤٦بەشی



پێغەمبەرایەتی(ﷺ)... ئەمەش بەشەش مانگ پێش هاتنە خوارەوەی (وحی) بوو ..

## خەڵوەت کێشان لەئەشکەوت دا:

دووساڵی کۆتایی پێش پێغەمبەرایەتی ئامادەسازیەکی ڕۆحی بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ)بۆ پێشوازی کردن لە(وحی)و سروشی خوایی ...خوای پەروەردگار وای لێکرد کە لەناخیدا حەز بەخەڵوەت بکات، بۆیە گەڕا بۆ شوێنێك تا بەتەنها بیێ دانیشیێو بیربکاتەوە، کەوتە وردبونەوە لەکێوەکانی دەورروبەری مەککە چوو بەرەو زنجیرە چیای (نور )، گەیشتە ئەشکەوتی (حراء) .... دیارە گەیشتن بە ئەشکەوتی (حراء) هەروا کارێکی ئاسان نیە دووری لەحەرەمەوە ٣ میلەو دەکەوێتە سەر لوتکەی چیایەکی بەرزو بەردەڵان و سەخت جا لەوێوە مەککەو کەعبەو دەورروبەرو ئاسمان و کێوەکانی دەبینی ....

تەنها کارێ کە لەنێو ئەشکەوتەکەدا ئەنجامی ئەدا بەندایەتیو بیرکردنەوە بوو، ...بیر کردنەوە لەبەدیهێنراوەکانی خوا، بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) چەند شەوێکی دیاری کراو بەندایەتی کرد... متمانەی زۆر بوو بەخوا، لەبەرئەوەی بیر لەدروست بوون دەکاتەوە، بیر لەگەورەییو دەسەڵاتی دەکاتەوە بیر لەکۆنتڕۆڵکردنی ئەم گەردونە دەکاتەوە کەمولکی (الله)یە.

بێگومان بیرکردنەوە لەبەدیهێنراوەکانی خوا زاتی خوا دەهێنێتە یادو زمان پاراو دەکات بەتەسبیحات و سوپاسگوزاریی ..

بەداخەوە ئەمرۆ کەم کەسنەم جۆرە پەرستشە ئەنجام ئەدات ...

لەخاتوو عائیشەیان پرسی: لەهەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) چی زۆر سەرنجی ڕاکێشایت؟!

فەرمووی: شەوێك لەشەوان بینیم نوێژی دەکردو دەگریا هەتا ڕیشی بەتەواوی تەڕ بوو پاشان کڕنوشی بردو گریا، هەڵساپەوە هەر دەگریا، چوە سوژدەوە هەر دەگریا، بەرزبوەوە هەردەگریا، سوژدەی بردەوە هەر دەگریا، بەردەوام بوو لەسەر گریان هەتا بیلال هاتە خزمەتی تامۆڵەتی بانگدانی بۆ نوێژی بەیانی لێوەربگرێت، بیلال پرسی: (یارسول الله) چی دەتگرێنێ فەرمووی: بیلال چۆن ناگریم ئەم ئایەتانەم شەو بۆ هاتووە:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ* الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ ال عمران ١٩٠-١٩١

بەدرێژایی ئەو شەوە بیرکردنەوە لەگەورەیی خوا پێغەمبەری(ﷺ) گریاند، بەداخەوە بیرکردنەوە کەم بۆتەوەو دڵەکان ڕەق بوون و چاوەکان ووشك بوون!!

دەگێڕنەوە کە لە(أم درداء)یان پرسیوە: پەرستشی (أبو درداء) چۆن بووە؟ وتویەتی: بەزۆری بیرکردنەوە بووە...

(عامر)ی کوڕی(عبد قیس) کەیەکێك بوو لە(تابعین) دەڵێت گوێم لەیەکێك و دووان سیان تا ١٠ هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیان ووت: نورو ڕوناکی ئیمان و باوەڕ بیرکردنەوەیە ...

شێخ (حسن)ی(بصری) دەڵێت: بیرکردنەوەی سەعاتێك لەشەونوێژی ساڵێك چاکترە!! چونکە ناخی مرۆڤ دەهەژێنێ‌و بەخۆیدا دەچێتەوەو تەوبە دەکات و بەشەوقەوە خواپەرستی دەکات.

(سفیانی الثوري)یش دەڵێت: بیرکردنەوەی شەوێك لەشەونوێژیساڵێك چاکترە!!

کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) لەئەشکەوتی(حراء)دا سەرقاڵی بیرکردنەوەبوو، سەیری ئاسمان وگەردوونی دەکرد پاشان سەیری کەعبەو سەیری بتەکانی ناویو دەورو بەری دەکردو بەخۆی دەوت: ئەو بت و شتە ناشرینانە هەرگیز شایستەی ئەوە نین کەبپەرسترێن !!

ئەم بەندایەتی کردنە دوائامادەکاری بنچینەیی بوو(ﷺ) خاتوو (خدیجە) ٢ڕۆژ یان ٣ ڕۆژ لەو دە ڕۆژەی کەمێردەکەی لەئەشکەوتەکەدا دەمایەوە ئەویش لای دەمایەوە، چونکە قەناعەتی تەواوی هەبوو بەوەی کەمێردەکەی کەسایەتیەکی مەزنەو بیر لەکاری گەورە دەکاتەوە ...

پێغەمبەریش(ﷺ) دەرکی بەژیریو سەلیقەی(خدیجە) کردبوو بۆیە خستبویە ڕیزی (آسیة)و(مریم)ی کچی (عمران) هەروەها فەرموویەتی: (( باشترین ئافرەت خاتوو خدیجەیە)).

خەڵوەتی پێغەمبەر(ﷺ) گۆشەگیریی نەبوو،بەڵکو سەرەتایەکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ هەڵگرتنی پەیامی خوا، لەبەرئەوەی باوەڕدار داوای لێکراوە چاکسازی بکات لەو واقیعەی کەلەگەڵ شەرعی خوادا ناگونجێ ئەویش بەفەرمان کردن بەچاکەو دورەپەرێزی لەخراپە،کەواتە: کەمێك بەتەنها بوون نەك بەتەواوی گۆشەگیربوون و دابڕان لەخەڵك ... چونکە ئایینی ئێمە ئایینی پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونە بەخەڵکی، کەواتە لەبەرنامەی بانگەوازدا داخران و دابڕان نیە، پێغەمبەر(ﷺ) لەوەودوا ئەوحاڵەتەی ناونا (الأعتکاف) کە لەمزگەوتەکاندا ئەنجام دەدرێت بەتایبەت لە ١٠شەوی کۆتایی ڕەمەزندا ...



**دابەزینی سروش (الوحی) :**

﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ* وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ* لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ* تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ* سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾ (القدر).

دابەزینی (وحی)وسروش بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) چەند ئاماژەیەکی تیایە، دابەزینی لەو شوێنە دور لەئاوەدانیو سەخت و دژوارەدا لەجیاتی دابەزینی لەکۆشکێکی ڕازاوە یاخود لەنێو ئاوەدانیەکی گەورەدا ئەوەمان تێدەگەیەنێت کەخوای گەورە دەیەوێت سەرەتای ئەم ئایینە لەسەر بنەمای هێزی بیرو هێزی پەیام ڕابگرێت، نەك لەسەر چەند کارێکی ڕوکەش وفانی کەهیچ بەهایەکی نەبێت لە(واقع)دا جگە لەهزری ناژیرو هەرزەبیرەکان ئەوانەی کەهەر ڕواڵەت و ڕوکەش دەبینن دورن لەسەرنجدان وتێفکران و تێگەیشتن لەپشتەوەی ڕوکەشەکان، سەرەتای هاتنی جوبرەئیل بە(وحی)وسروشەوە بۆ پێغەمبەر لەئەشکەوتی پیرۆزی (حراء)دا بوو، کەئەوە یەکەم گەیشتنی ئاسمان بە زەوی بوو لەوێدا، لەناکاو پێغەمبەر(ﷺ) لەئامێزی جوبرەئیل دا خۆی بینییەوە ...

بەڵێ، لەئەشکەوتی (حراء)دا ڕوناکی ئاسمان گەیشت بەڕوناکی زەوی ...

یەکەم دابەزینی جوبرئیلە بۆ سەرزەوی لەدوای ٥٤٠ ساڵ لەکۆبونەوەی لەگەڵ حەزرەتی عیسادا سلاوی خوای لێبێت ئەم دیمانەیە بە لەئامێزگرتن دەستی پێکرد ... ئەشکەوتی (حراء) شوێنێکە بەڕوکەش سادەوساکارە بەلام گەورەترین پەیامی خوایی لە ئاسمانەوە هێنا بۆ سەراپای زەوی ... پەیوەندی ئاسمان بوو بەزەوییەوە کە ٢٣ساڵی خایاندو ئاسەواری هەتا ڕۆژی ڕەستاخێز بەردەوام دەبێت... (أم أیمن) کە (جاریە)ی پێغەمبەر بوو(ﷺ) دوای ئەوەی

پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی‌کرد (ابو بکرو عمر ) سەردانێکیان کرد کاتێ چوونە لای سەیریان کرد دەگری، وایان زانی لەبەر کۆچی‌دوایی پێغەمبەری خوا دەگری(ﷺ) ووتیان: (أم أیمن) هێور بەرەوە ئەی نازانی خوای گەورە باشتری هەڵبژاردووە بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئەویش وەڵامی دانەوە ووتی: سوێند بە خوا بۆ کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ناگریم چونکە ئەزانم ئەوەی خوای گەورە بۆی ئامادەکردووە زۆر بەنرخترو چاکترە، بەڵکو بۆ بچڕانی وەحی دەگریم لەئاسمانەوە ....(أم أیمن) هەستی بەبەهاو گەورەیی وەحی دەکرد، دەرکی بەشیرینی پەیوەندی ئاسمان کردبوو بەزەوییەوە ...

کاتێك پێغەمبەر( ﷺ) (جبریل)ی بینی ئاسۆی گرتبوو، ٦٠٠ باڵی هەبوو کاتێ ڕایدەوەشاند دوڕوگەوهەری لێ‌دەبۆوە، دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) (جبریل) تەنها یەکجار قورئان دەوردەکاتەوە ئەویش لەشەوی قەدردا ... ﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا .... ﴾ (القدر -٤)

الروح (جبریل)ە سلاوی خوای لێ بێت ...

دیمانەی ئەو دووخۆشەویستە بەلەئامێزگرتن دەستی پێکرد چونکە ئامێز سومبلی ئاشتی‌و خۆشەویستیە ...

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بەشەش مانگ پێش هاتنی (وەحی) خەوەکانی وەك ڕۆژی ڕوناك دەهاتنە دی، کەواتە دەبێت کارێکی بەرجەستەکراوو بەڵگەدار ڕوبدات هەتا بۆی دەربکەوێت ئەوەی دەیبینێت خەون نیە بەڵکو ڕاستیەکەو دوورە لەخەیاڵ..

دابەزینی وەحی لە١٠ شەوی کۆتایی ڕەمەزندا بوو لە نیوە شەوێکی بێ‌مانگەشەوی تەواو تاریکدا (جبریل) هاتە خزمەتی سلاوی خوای لێ‌بێت ...

بیهێنەرە بەرچاوت ئەو دیمەنەو قورسیی هەڵوێستەکە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) بێنە بەرچاوت.

(جبریل) سلاوی خوای لێبێت یەخەی پێغەمبەری کەمێك ڕاکێشاو فەرمووی: بخوێنە (إقرأ)

ئەویش فەرمووی:من خوێندەوار نیم ..

ئینجا باوەشی پیاکردو توندگوشی بەخۆیەوە هەتا تەواو ماندوبوو بەجۆرێك هەموو لاشەی بووە عارەق پاشان بەریداو فەرمووی: (إقرأ).

پێغەمبەر(ﷺ) دووبارە فەرمووی: من خوێندەواریم نیە ...

ئەمجارە جبریل توندتر لەجاری پێشوو باوەشی پیاکرد پێغەمبەری(ﷺ) بەتەواوی ماندووکردو دوبارە فەرمووی: (إقرأ) بخوێنە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چی بخوێنم ...

جبریل سلاوی خوای لێبێت فەرمووی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ* خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ* اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ* الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ* عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ العلق/١-٥.

دوای ئەو بەسەرهاتە پێغەمبەر(ﷺ) لەئەشکەوتەکە هاتەدەرو بەدڵی پڕ لەغایەلەو لاشەی پڕ لەعارەقەوە، بەدەم لەرزێکی زۆرەوە گەڕایەوە ماڵەوە ... ئەم سەرەتا توندە ئاماژەیەك بوو بۆ دەستپێکردن و هاتنی کارێکی زۆرگەورە ... ئەویش چاکسازی کردنە لەنێو مرۆڤایەتیدا ....﴿ خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ...﴾

ئەوەی مایەی تێبینیە(جبریل )پێی نەفەرموو کەتۆ بوویتە پێغەمبەری خوای گەورە، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی لەوەرەقەی کوڕی نەوفەلەوە زانی، لەوەوودوا (جبریل) پێی ڕاگەیاند ....

وەك وتمان پێغەمبەر(ﷺ) لەئەشکەوتەکە دابەزی بەرەو لای(خدیجە )ی هاوسەری بەدەم لەرزەوە فەرمووی: دام پۆشن، دام پۆشن... لێرەدا خاتوو خەدیجە هەڵوێستی ئافرەتێکی سەلارو ژیری نواند کەدەیەوێت ورەی مێردەکەی بەرزبکاتەوە، بەمەش بووە یەکەم کەس کەپێغەمبەری(ﷺ) دڵقایم و ڕاوەستاو کرد ... کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەو حاڵەتەوە گەیشتەوە ماڵ خاتوو خەدیجە لێی پرسی: ئەوە چیتە؟! ئەویش ئەوەی بەسەریدا هات بۆی گێڕایەوە ... خاتو خدیجەیش بەوپەڕی متمانەو هێزەوە وتی: سوێند بەخوا هەرگیز خوای گەورە نوشستیونەهامەتی بەسەر تۆدا ناهێنێت.

چونکە تۆ پەیوەندی خزمایەتی ڕادەگریت، دەستگیرۆیی کەم دەستان دەکەیت، ڕێز لەمیوان دەگریت، دەست دەگریت بەڕاستیەوە، بەمەش پێغەمبەر(ﷺ)ئارام بووەوەو دڵنیایی بۆ گەڕایەوە ...

پێغەمبەر (ﷺ)چاوەڕێی پەیام نەبوو بەڵکو چاوەڕێی حەق و ڕاستی دەکرد، خۆ ئەگەر چاوەڕێی پەیامی بکردایە تابۆی بێت ئەو حاڵەتەی بەسەردا نەدەهات کەبەخۆیەوە بینی لەترس ودڵەڕاوکێ، خێزانیشی تا ئەوساتە نەیدەزانی کێیە هاتۆتە لایو چی بەسەرهاتووە... پیاوێك هەبوو لەمەککە ناوی(أبو عامر)ی(راهب) بوو ئەم پیاوە وای دەزانی خۆی دەبێت بەکۆتا پێغەمبەر، بۆیە خواپەرستی زۆری دەکردو خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەم کارە، کاتێك پەیامی خوا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هات هەڵگەڕایەوەو لەداخا وەك شێتی لێهات و کەوتە دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆری (حەق) بور، ئەوەبوو پەیامی خوای بۆ هات، هەر ئەویش بوو لەغەزای(أحد)دا چاڵی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەڵکەند، ئیتر دوای ئەوە ناونرا(أبو عامر)ی (فاسق) ...

**نمونەی هاوسەرێکی سەلار:**

دەستگیرۆیی‌وکۆمەکی خاتوو خەدیجە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کاریگەریەکی گەورەی هەبوو بەمەش بووە نمونەی هاوسەرێك کەدەیزانی چۆن لەنزیك مێردەکەیەوەبێت، وەچۆن کۆسپ و ئاستەنگەکان لەسەرشانی لابات. خاتوو (خەدیجە) هیچ لێکدانەوەیەکی تەواوی نەبوو لەسەر ئەو بەسەرهاتەی کەپێغەمبەر (ﷺ) بۆی گێڕایەوە لەگەڵ ئەوەشدا هێوری دەکردەوەو ورەی بەرزدەکردەوەو دڵنیایی بۆ دەگێڕایەوە ...

پیاو هەرچەندێك بەهێز بێت لەکاتە سەخت و پڕ لەناسۆرەکاندا پێویستی بەخێزانی دەبێت بۆدڵنەوایی‌و هێورکردنەوەی، ئەمەش زیاتر پاڵی پێوەدەنێت تا ڕاوەستاوترو جێگیرتر بێت ..

فەرمایشتەکانی خاتوو(خەدیجە) لەدڵ ودەروونی پێغەمبەردا(ﷺ)دەنگی دەدایەوە نەخێر، سوێند بەخوای گەورە، خوای باڵادەست نشوست و نەهامەتی بەسەر تۆدا ناهێنێت ئیتر ئەوەبووە مایەی ڕەواندنەوەی ترسەکەی‌و ورەی بەرزکردەوە.

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوەستاوکرد ورەیشی بەرزکردەوە، بەوەی کەگوێی لێگرت، ئەمەش هەڵوێستێکی گرنگە لەپەیوەندی هاوسەریی پێویستی پیاو و بەئافرەتە بەیەکتر وەکو یەك، هەتا هەردووکیان گوێ بۆ یەك بگرن ... زۆر جار پیاو زیاتر پێویستی بەم هەڵوێستەیە... ئەویش لەبەر ئەو ماندووبوون و ڕەنج و زەحمەتەی کەبەدرێژایی ڕۆژ دەیداو شەو بەماندوویی دەگەڕێتەوە، بۆیە لەو حاڵەتانەدا ئاتاجی یەکێکە گوێی بۆ بگرێت... خاتوو خەدیجە بەجوانترین و تەواوترین شێوە ئەوەی ئەنجامدا...هەروەها خاتووخەدیجە هەمیشە هاوبەش و

هاوكاری هەموو حاڵەتێكی بوو لەوكاتەی كەلەئەشكەوتی(حراء)دا بەندایەتی دەكرد، بەدەستی خۆی خواردنی دەبردو لەگەڵیا چەند ڕۆژێك دەمایەوەو بەشداری خەمەكانی دەكرد، ئەمەش دەبێت سروشتی هەر هاوسەرێك بێت و سیمای بەرچاوی پەیوەندی خێزانیان بێت...

هەر لەبەرئەمانە بوو كەخۆشەویستیخاتوو(خدیجە) هەرلەدڵی پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو تەنانەت پاش كۆچی دوایشی ...

## ڕەوشت جوانی :

ئەوەی تێبینی دەكریتەوەیە كاتێ خاتوو(خدیجە) ویستی ورەی پێغەمبەر(ﷺ) بەرزبكاتەوە وتی: تۆ ڕێزی میوان دەگریت و كۆمەكی بێدەستان دەكەیت و پەیوەندی خزمایەتی ڕادەگریت و هەمیشە لەگەڵ حەق و ڕاستیدایت، هەموو ئەمانە كۆمەڵە سیفاتێكی ڕەوشتیو چەمكی كۆمەڵایەتین.

ئەمەش مەسەلەیەكی زۆر گرنگە، لەبەرئەوەی ئەو جیهانەی تیایدا دەژین لەچوار پۆل خەڵك پێك دێن پۆلێكیان دینداریەكی باش و ڕەوشتێكی خراپ، پۆلێكی تریان ڕەوشتی جوان بەلام دور لەدینداری، پۆلێكی تریش ڕەوشت جوان و ديندار، پۆلێكی تر بەدڕەوشت و بێدین. جا كاتێ خەڵك دەبینین كابرا دیندارە بەلام ڕەوشتی ناشرینە، ئیتر هەموو دیندارەكان تۆمەتباردەكرێن و عەرەق خۆرو قومارچیو شەڕواڵپیسەكان دەبنە پیاو چاك.

لەڕاستیدا حەق وایە موسڵمان هەردوو لایەنەكە پێكەوە كۆبكاتەوەو هەوڵبدات بگاتە لوتكەی ڕەوشت بەرزی، هەم خاوەن ڕەوشتی جوان بێو هەم دینداریەكی جوان و پتەوی هەبێ، گەنجی ديندار دەبێت هەوڵبدات بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (لەوەی زۆر تەرازووی چاكە سەنگین دەكات

رەوشت جوانیە)، هەروەها دەفەرموێت: (چاکترینی ئەوانەی کەپابەندی ئیسلامن ئەوانەن کەرەوشتیان بەرزە) هەروەها دەفەرموێت(ﷺ) (زۆرترین کارێك کەموسلمان دەباتە بەهەشتەوە تەقواو دینداریو رەوشت جوانیە)... هەروەها فەرموویەتی : (نزیکترین کەستان لەکۆری منەوە لەرۆژی قیامەتدا ئەوانەتانن کەرەوشتیان زۆر بەرزو جوانە) .

**متمانەبوون بەخوا :**

خاتوو(خەدیجە) کۆمەڵێك لەسیفاتە رەوشتیەکانی ریزکرد کەهاوسەری بەرێزی ناوبانگی پیدەرکردبوو هەروەها دلنیاشی کرد کەئەستەمە خوای گەورە تووشی نەهامەتی بکات..

ئەمەش متمانەیەکی کەم وێنەیە بەخوا ...

وانەیەکە بۆ هەمووان چونکە هەتا کاری خێرو چاك ئەنجام بدەین لە خراپە و نەهامەتی بە دووردەبین .

دوای ئەو هەموو هەڵوێستە گەورانەی کە خاتوو(خەدیجە) لەبەرامبەر پێغەمبەردا (ﷺ) نواندی لەبەرزکردنەوەی ورەو هیمەتی پاشان هەستاو داوای لێکرد پێکەوە سەردانی (ورقە)ی کوری (نوفل)ی پورزای بکەن ...

ئەم پیاوە مەسیحی بوو تەمەنی ٩٠سالێك دەبوو، شارەزایی لە تەورات و ئینجیل دا هەبوو، خاتوو (خەدیجە) چووە لای (ورقە)و پێی وت: پورزای بەرێزم گوێ لەبرازاکەت بگرە، پێغەمبەریش بەسەرهاتەکەی بۆ گێرایەوە، (ورقە) چاك گوێی بۆ گرتبوو... هەرکەپێغەمبەر لێبووەوە (ورقە) یەکسەر وتی: بەراستی تۆ پێغەمبەری ئاخر زەمانی، تۆ (وحی )ت بۆ هاتووەو ئەو خەڵکەش بروات پێناکەن، ئازارت دەدەن لەگەڵتا بەجەنگ دێن دەریشت دەکەن، خۆزگایە



گەنج وبەهێز دەبووم ئەوکاتەی کەهۆزەکەت دەرت دەکەن،... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هۆزەکەی خۆم دەرم دەکەن؟! وتی: بەڵێ، هیچ کەسێ نەبوە کەوەك تۆ پەیامی لەم شێوەی هێنابێ‌و دژایەتی نەکرابێت... خۆ ئەگەر فریای ئەو ڕۆژانە کەوتم بەتەواوەتی پشتت دەگرم ...

بەڵێ: ڕێگەی (إصلاح )و چاکسازی پڕە لەکۆسپ وئاستەنگ، ناپوخت وستەمکاران وادەزانن بەرژەوەندیەکانیان لەمەترسیدایە، لەبەرئەوە جۆرەها بوختان و پیلان و کێشەیان بۆ دروستدەکەن، کەواتە دەبێ دڵنیابین ڕێبازەکە دوورو درێژەو ماندوو بوون و قوربانیشی دەوێت.

دیارە (ورقە) چاك قوڕەیش و بەرژەوەندیەکانی دەناسی، بۆیە دڵنیابوو کەئەم پێغەمبەرە بەرێزە زۆر دژایەتی دەکرێت.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتەدەر (ورقە) بەخاتوو(خەدیجە)ی وت: پێی بڵێ باخۆڕاگرو دامەزراو بێت.

## ئەی گەنجانی ئیسلام دامەزراوبن:

جیهان لەنێوەندی جەنگی جیهانی یەکەم ودووەمدا نەیان دەزانی ئەو جەنگە بەجەنگی جیهانی یەکەم ودووەم ناودەبرێت بەڵام مێژوونوسان لەدوایدا ئەوناوەیان لێنا ..

ئێمەش ئەمڕۆ لەنێوەندی چەندین کێشەو قەیرانی گەورەدا دەژین بەتایبەت لەدوای ڕوداووی ١١ی ئەیلولەوە، لەڕاستیدا ئێمە ئێستا لەجەنگی جیهانی سێیەم دا دەژین و زۆر ئاتاجی خۆڕاگرین، کاتێك (ورقە) ئەو وتانەی بەپێغەمبەر وت قەبارەی ئەو ئەرکەی دەزانی کەپێغەمبەر(ﷺ)لەسەر شانیەتی ... کەواتە



لەم حاڵەتەدا گەنجانی بانگەوازی ئیسلامی زۆر ئاتاجن بەتەئکیدکردنە سەرماناکانی خۆڕاگری ..

## ( خۆزیا گەنج دەبووم )!!

ئەو وتەیەی (ورقە)ی کوڕی (نوفل) بەپێغەمبەری خوای فەرموو خۆزگایە گەنج دەبووم، دیارە پێش وەخت دەیزانی کەبانگەوازو چاکسازی کردن و هەڵسانەوەی جیهان پێویستیان بەلاوانە، بەهێزی لاوان و سوربوونیانە لەسەر گرتنەئەستۆی پەیامەکە .... ئەو وتەیەی کە (ورقە) بەپێغەمبەر(ﷺ)ی فەرموو (( خۆزگە ئەوکاتەی گەلەکەت دەرت دەکەن من گەنج دەبووم هەتا بتوانم پاڵپشتیەکی پتەوت بکەم ... ئەم قسەیەی لەکاتێکدا کرد تەمەنی ٩٠ ساڵ بوو بەلام بەهۆیەوە پاداشتی هاوەڵان و شەهیدانی دەست کەوت هەرچەندە پاش ماوەیەك مرد ... بەلام پاداشت بەنیەتە !!!

خوای گەورە ویستی وابوو نەوەد ساڵ بژی هەتا ئەو قسەیە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بکات و پاشان دوای حەفتەیەك بمرێت!!

پاش ئەو دیمانەیەی(حراء،جبریل)خۆی نیشانی پێغەمبەردا(ﷺ) نێوان ئاسمان و زەوی پڕکردبوو،بەردەوام دەیفەرموو: ئەی(محمد) تۆ پێغەمبەری خوایت، منیش(جبریل)م...

## نوێژ لە پێش هەموو شتێکەوە:

(جبریل) سلاوی خوای لێبێت پێغەمبەری(ﷺ) برد بەرەو بیابان، بەباڵی دای لەزەوی‌و کانیەکی هەڵقولاند بۆ ئەوەی فێری دەست نوێژی بکات ...

کەواتە نوێژ یەکەم وانە بوو کەبەکردار (جبریل) پێغەمبەری(ﷺ)فێرکرد .

لەسەرەتاوە نوێژ دوو ڕکات بەیانیان و دوورکات لەشەودابوو، پاشان لەشەوی (إسراء و معراج)دا خوای گەورە پێنج نوێژەی فەرزکرد .

نوێژ پایەو کۆڵەکەی ئایینە کەواتە یەکەم وانەی (جبریل) بۆ پێغەمبەر(ﷺ)نوێژ بوو بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت: لوتکەی کارەکان ئیسلامەو پایەکەی نوێژە، هەروەها فەرموویەتی: ئیسلام لەسەر پێنج بنەما بنیات نراوە، ئەو کەسەی نوێژەکانی دەفەوتێنێت کۆڵەکەو پایەی سەرەکی ئاینەکەی دەڕوخێنێت کەواتە چۆن بینایەك خۆی دەگرێت کاتێك پایەی سەرەکی نەمابێت، لەبەرئەوەی واز لەنوێژ دەهێنێت لەبازنەی توڕەبوونی خوای گەورەدایە ... کەواتە هەرگیز نەکەین واز لەنوێژ بهێنین. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (( کلیلی بەهەشت نوێژە ))، (( ڕوناکی باوەڕدار نوێژە ))، (( شیفاو چارەسازی موسڵمان نوێژە ))، لەبەرئەوە کاتێك پرسیار لەپێغەمبەر(ﷺ) کرا باشترین کار چیە؟ فەرمووی: نوێژکردن لەکاتی خۆیدا ....

یەکەم سورەت کە هات دوای(إقرأ) سورەتی(المزمل) بوو کەگرنگی نوێژی لای پەروەردگاری بەیان دەفەرموو: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ* قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلاً...﴾ بەڕاستی پەرستشێکی گەورەو گرنگ و پیرۆزە.

دواتر سورەتی(المدثر) نازڵ بوو پاشان سورەتی (الفاتحة) هەموو ئەم سورەتانە وێنای کەسایەتی هەڵگری پەیامەکە دەکەن...سورەتی یەکەم (إقرأ).. باس لەگرنگی عیلم بوو پاشان(المزمل )...کەوزەی ڕۆحی بەرزدەکاتەوە.. دوای ئەمە سورەی(المدثر)... کەباس لەبانگەواز دەکات (قُمْ فَأَنذِرْ)... دوای ئەمە سورەتی(الفاتحه) ... ئەمەش بەرنامەی خوای گەورەیەو پەیامی جیهانیەتی، بێگومان هەموو ئەم سورەتانە سوپاسی گەورەی دەوێت، لەسەر ڕەحمەت و میهری ئەو زاتە (الرحمن) و(الرحیم)ە، لەبەرئەوەی دنیای نەکردۆتە جێگای



مانەوەی هەمیشەیی بەڵکو ڕۆژێکی ئامادەکردووە کەسەراپای مرۆڤایەتی لەو ڕۆژەدا ئامادە دەکات بۆ لێپرسینەوە، چونکە ئەو زاتە: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ ە ...

دوای ئەوە دوو مانگ (وحی) سروش نەهات لەماوەی ئەو دوومانگەدا پێغەمبەر(ﷺ) ژیانێکی زۆر سەخت و دژواری گوزەراند لەبەرئەوەی وایدەزانی خوای گەورە پەیامەکەی بەکەسێکی تر بەخشیوە، هەتا سورەتی(الضحی) نازڵ بوو ﴿وَالضُّحَى* وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى* مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى* وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَى* وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى* أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى* وَوَجَدَكَ ضَالّاً فَهَدَى* وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى* فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ* وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ* وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾..(الضحى)

دوای هاتنی ئەم سورەتە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بەدانانی بنەمای یەکەم لە کاری بانگەواز، ئەویش هەڵبژاردنی کەسانی ناوازەبوو بۆ ڕواندنی تۆوێکی بەهێز بۆ بانگەوازی خوایی لەسەر بنەمایەکی پتەو، یەکەم کەس کەهەڵیبژارد (أبوبکر الصديق) بوو، تەمەنی ٣٨ ساڵ بوو، بازرگانێکی سەرکەوتوو بوو، خاوەنی ڕەوشتی جوان بوو بەجۆرێك قورەیش هەموو خۆشیان دەویست ... هەروەها شارەزای ڕەچەڵەك و پشتاو پشتی عەرەب بوو ..

هەروەها خاتوو خەدیجەی هەڵبژارد لەئافرەتاندا نەك لەبەرئەوەی کە هاوسەرێتی بەڵکو لەبەرئەوەی کەسێکی هەڵبژاردەو ناوازەبوو، دوای ئەمان (علي) کوڕی (أبو طالب)ی هەڵبژارد ئەویش بەهۆی ئەوەی پێغەمبەری کاتێ بینی(ﷺ) نوێژی دەکرد لەوکاتەدا تەمەنی ١٠ساڵ بوو، لەپێغەمبەری(ﷺ) پرسی خەریکی چیت؟ ئەویش باسی ئاینی نوێی بۆکرد پاشان پێی فەرموو: ئایا ئیتر موسڵمان نابیت؟ ... ئەویش وتی: ڕێگەم بدە بیرێکی لێبکەمەوە... ئەمەش

ئەگەر بەڵگەبێت بۆشتێك بەڵگەیە لەسەر پێگەیشتوویی کەسایەتی ئەم منداڵە کەوای لیْکرد بەبێ بیرکردنەوە وەڵام نەداتەوەو بڕیار نەدات.....

ئیتر ئەوەبوو بۆ ڕۆژی دواتر موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.

دوای ئەوە ڕۆژێك (أبوطالب)(علی) کوڕی بینی نوێژی دەکرد، لێی پرسی ئەوەچی دەکەیت؟ وتی: شوێن محمد کەوتووم.. (أبوطالب) وتی: لەگەڵیا بمێنەرەوە سوێند بەخوا بەحەق نەبێ فەرمانت پیْناکات... بەڵێ ئیسلام بەم ٤ کەسە دەستی پیْکرد پێغەمبەر(ﷺ)، خاتوو (خدیجە) ،(علی و أبو بکر) ...

پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازی دەست پێکرد لەپیاواندا تەنها أبوبکری بەدەستەوە بوو لەئافرەتانیشدا تەنها (خدیجە)، لەمێرد منداڵانیشدا تەنها (علی) خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت ...

پێغەمبەر(ﷺ) لەبەردەم کارێکی زۆر گراندابوو، ئەویش چاکسازیە، چاکسازی کردن لەزەویدا چاکسازی لەبواری ئافرەت و بەندەو منداڵ و ڕامیاریو کۆمەڵایەتیو ئابوریدا... چاکسازی سەراپای دنیا، بۆ ئەم کارە گەورەیەش جگە لەهێزی باوەڕو متمانە بەخوا هیچی تری پیْنەبوو، نەخاوەنی پیاوانێکی زۆر بوو، نەخاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆر، بەڵکو سەرمایەی بانگەوازەکەی ئەو ڕەوشتە بەرزو باڵایەبوو کەخوای گەورە هەر لەمنداڵیەوە پێی بەخشیبوو بۆ گرتنەدەستی بانگەوازی نوێ، شایانی باسە تائەوکاتە تەنها چوار سورەتی لەقورئان بۆ هاتبوو سورەتی عیلم(إقرأ)، سورەتی ئامادەکاری ڕۆحی (المزمل)، سورەتی دەست بەکاربوون (المدثر) هەروەها ئەو سورەتەی کەوێنەی ڕێگای ڕاستی پرۆگرام دەکێشێ کە(فاتحە)یە. لەبەرامبەر ئەم حاڵەتەدا دەبوایە پێغەمبەر(ﷺ)پلانێکی پتەوی هەبێت بۆ ئەم کارە، لەبەرئەوە یەکەم هەنگاو لەهەنگاوەکانی کاری بانگەواز کەپێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامیدا بانگهێشت و



دیاریکردنی کەسایەتیە ناوازەو بەناوبانگەکانی نێو کۆمەڵگا بو، هەتا ببنە یەکەم تۆوی نێو بونیادی کۆمەڵگایەکی موسڵمان، لەڕاستیدا دیاریکردنی ئەو کەسایەتیانە هەڕەمەکی نەبوو، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) بیری قوڵی لێدەکردەوەو دەگەڕا بەدوای چاکترینیاندا لەپێناو داڕشتنی بناغەیەکی پتەو بۆ بانگەوازە پیرۆزەکەی ...

دیارە گەر بانگەوازێك خاوەنی ئەم بنەما پتەوو بەهێزەبێت مەحاڵە بتوانرێت دەستی بەسەردا بگیرێت ..

حاڵ بەم شێوەیە۳ساڵ بەردەوام بوو، لەمیانەی ئەو سێ ساڵەدا نزیکەی دووسەد کەسی بانگهێشت کرد. کەهەموویان ناوازەو خاوەن هەڵوێستی بەرزبوون. ئەوانەی لە ژیانیاندا سەرکەووتوبوون، لەبەرئەوە لەپەڕاوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەردا بەسێ ساڵی یەکەمی بانگەواز دەوترێت: ساڵانی نهێنی، لەکاتێکدا بانگکردنی کەسانی تایبەت بوو نەك بانگەوازی نهێنی، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی بانگ دەکرد کەمتمانەی تەواوی پێیان هەبوو، ئەوانەی خۆگربوون لەسەرەتاوە نهێنی یەکتریان دەپاراست...

خاتوو(خدیجە) یەکەم ئافرەت بوو دوای پێغەمبەر(ﷺ)کڕنوشی بۆ پەروەردگار برد، دووەم کەس (أبوبکرالصدیق) بوو. پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی (أبوبکر) دەفەرموێت:( کەسم بۆ ئیسلام بانگ نەکردووە کە دوودڵی نیشان نەدابێت، جگە لە (أبوبکر) کەیەکسەر فەرمووی: (( أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمد رسول الله ))... دوای ئەو (علی) کوڕی (أبو طالب) ئینجا (زید) کوڕی (حارثة)، کەواتە پێغەمبەر(ﷺ)ئافرەتێك و ڕاستگۆیەك و منداڵێك بەندەیەکی لەگەڵدا بوو ..

هەریەکێ لەمانە ئاستی بەرپرسیاریەتی سەرشانی خۆی دەزانی، (أبوبکر) لەماوەی یەك هەفتە لەدوای موسڵمان بوونی توانی(٦)کەس لە(١٠) مژدە پێدراوەکانی بەهەشت لەسەردەستیدا موسڵمان بێت. کەبریتی بوون لە: (عثمان)ی کوڕی(عفان)،(طلحة)ی کوڕی(عبیدالله)،(زبیر)ی کوڕی(عوام)، (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف)، (سعد)ی کوڕی(أبو وقاص)،(أبو عبیده)ی کوڕی (جرّاح) ...کە هەریەکەیان کەسایەتیەکی بەنرخ و خاوەن پلەو پایەی خۆیان بوون.

(عثمان) دەوڵەمەند بوو، (عبدالرحمن )ی کوڕی (عوف) بازرگانێکی شارەزا بوو،(طلحة و زبیر و سعد و أبو عبیده) لاو بوون، بەڵام لاوێکی ژیرو سەلیقەدار بوون. (عثمان و عبدالرحمن )یش تەمەنیان لەسی بەرەو ژوور بوو.

جاسەیر لەوەدایە کە (أبوبکر) لەهەفتەی یەکەمی موسڵمان بوونیدا توانی بەرهەمێکی گەورە پێشکەش بکات، ئەویش بەهۆی هەست کردن بەو بەرپرسیارێتی‌یەی کەلەناخیدا هەبوو .

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێت ئەگەر باوەڕی سەرجەم ئیمانداران بخرێتە تای تەرازوویەك و باوەڕی (أبوبکر)یش بخرێتە تاکەی تری، هێشتا (أبوبکر ) سەنگینتر دەنوێنێت ...

دوای چەند مانگێك ژمارەی موسڵمانان بووبە ٤٥ کەس لەهەردوو ڕەگەز، بەزۆری تەمەنیان لەدەوروبەری٢٥ساڵیدا بوو بێگومان هەر ئەوانە بوون کە لە داهاتوودا ئاینی ئیسلامیان گەیاندە ئەو ئاستە ... ٢٨ پیاو و ١٧ ئافرەت، ٣٢ کەسیان دەوڵەمەند و (١١) یشیان هەژار ، سەربە ١٦ هۆزیش بوون .

ئەوانەی لەماڵی پێغەمبەردا موسڵمان بوون ١٠ کەس بوون پێغەمبەر(ﷺ) خاتوو(خدیجه)،(زینب)،(روقیه)،(أم کلثوم)،(فاطمة)،دووکەنیزەك و (علی)کوڕی

(أبو طالب)، (زید)ی کوڕی(حارثة)، (سعد)یکوڕی(أبو وقاص) کەدەڵێت: ڕۆژانێك بوو خۆم بەتەنها چواریەکی ئیسلام بووم...(أشعث)ی کوڕی(قیس) لەوەرزی حەجدا هات بۆ بازرگانی (عباس)ی مامی پێغەمبەریشی لەگەڵدا بوو لەوکاتەدا ئەمان سەرقاڵی بازرگانی بوون تیشکی خۆر مەیلان بوو، پیاوێك هاتە دەرو دەستی کرد بەنوێژکردن پاش کەمێك مێرد منداڵێکیش هات و لەتەنیشتیەوە وەستاو ئەویش دەستیکرد بەنوێژکردن، پاشان ئافرەتێکیش هات و لەدوایانەوە نوێژی کرد، (أشعث)لە(عباس)ی پرسی: ئەمە کێیە، (عباس) وتی: (محمد)ی برازامە، وتی: ئەی ئەوە کێیە لەپاڵیدا،(عباس)وتی: برازایەکی ترمە، ناوی (علی) کوڕی (أبو طالب)ە، وتی ئەی ئەو ئافرەتە کێیە؟ ئەوەش (خدیجە )ی کچی (خویلد)ی هاوسەریەتی، وتی: ئەی ئەوە چی دەکەن؟ وتی: نوێژ دەکەن،(عباس) وتی: ئەم برازایەم دەڵێت من پێغەمبەرم، ڕۆژێك دێت (شوێنکەوتوانم ) دەست بەسەر گەنجینەکانی (کیسرا )و (قیصر)دا دەگرن.

پاشان عباس وتی: حەز دەکەیت قسەی لەگەڵدا بکەیت؟

(أشعث) وتی وازبێنە با بازرگانیەکەمان بکەین ...

جا (أشعث) دوای بیست ساڵ لەڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا موسڵمان بوو، لەو ڕۆژەدا هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) چاو بەئەسرین و یەکسەر وتی: ( أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أن محمد رسول الله ) پێغەمبەر((ﷺ) فەرمووی ئایا دەزانیت ئیسلام ئەوەی پێش خۆی دەسڕێتەوە، وتی: بۆ ئەوە ناگریم بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم هەلێکم بۆ هەڵکەوت ودەبوا سێیەم کەس بم لەئیسلامدا ... بەڵام گوێم نەگرت خۆزگایە بهاتمایەو گوێم لێبگرتیتایە..

دوای سێ ساڵ ژمارەی موسڵمانان تا دەهات زیادی دەکرد لەوکاتەدا بوبونە زیاتر لە(٨٠) کەس لەئافرەت و پیاو.... پێغەمبەر لە جیاتی ڕووبەڕووبونەوەی قورەیش، دەستی کرد بەبانگەوازکردن و چوونە ناوتیرەوهۆزەکان، چەند کەسێکی دیاریکراوی لێهەڵبژاردن بۆ گرتنە ئەستۆی بەرپرسیارێتی بانگەواز ...

چەند ساڵێك تێپەڕی ژمارەیان زیادی کردو هیچ جۆرە پێکدادانێك لەگەڵ قورەیشدا ڕووی نەدا، لەبەرئەوەی ئەو قۆناغە وا پێویستی دەکرد خۆی لەتورەکردن و ورووژاندنی قورەیش بپارێزێ، دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو قۆناغی دووەم ڕۆیشت لەقۆناغەکانی بانگەواز، ئەویش ئاشکراکردن و دەرخستنی ئیسلام بوو، ئەم قۆناغەیش بۆ هەر بانگەوازێك پێویستە گەر بیەوێت بیروباوەڕی خۆی بەسەراپای جیهان بگەیەنێت... هاوەڵانی پێغەمبەریش(ﷺ) بەگواستنەوەی بانگەواز لەقۆناغی یەکەمەوە بۆ دووەم بەتەواوی ئامادەبوون بێدوودڵیو دڵەڕاوکێ، گوێڕایەڵی ڕەهای پێغەمبەریان(ﷺ) قبوڵ کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ساتەوەختی گواستنەوەی قۆناغەکانی بانگەوازی هەڵدەبژارد لەقۆناغێکەوە بۆئەوی تر، قورەیشی خستە حاڵەتی پەرچەکردارەوە (رد الفعل) ئەم تایبەتمەندیە لەخەسڵەتە بەرچاوەکانی پێغەمبەرە(ﷺ) کە بەدرێژایی باسی ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) دەیبینین.

بەوەی کەهەمیشە دەست پێشخەربووە، بۆیە دەبێت موسڵمان بۆ سەرخستنی ئاینەکەی هەمیشە بۆهەر کارێکی خێر دەست پێشخەر بێت و پلان و نەخشەی هەبێت بۆ گەیشتن بەئامانجەکان.

لەم کاتەدا بوو فەرمایشتی خوای گەورە دابەزی: ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ....﴾(الحجر/٩٤)



واتە ئیسلام ڕابگەیەنەو چ فەرمانێکت پێدەدرێت ئەنجامی بدەو بانگەوازی خوایی ئاشکرابکە، (فاصدع) ئاماژەیە بەو ناهەموارییانەی کەڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

پاشان ئایەتی ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾(الشعراء/ ٢١٤) هات بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاریدا ئایینی نوێ بەکەسە نزیکەکانی ڕابگەیەنێت، ئەوە بوو (أبوطالب)و هەندێك لەئەندامانی هۆزی (هاشم)ی کۆکردەوە کەژمارەیان ٤٥پیاوو ژن بوون، دوای ئەوەی نانیان خوارد، ویستی قسەیان بۆ بکات، (أبو لهب) ڕێگەی پێنەداو وتی: گوێبگرە (محمد) ئێمە توانای بەگژاچوونەوەی هەموو عەرەبمان نیە ئەگەر تۆ لەسەر ئەم بیروباوەڕەی خۆت بەردەوام بیت ئەوا قوڕەیش و سەراپای عەرەب لەڕووی خۆت و هۆزەکەتدا دەوەستنەوە، ئەو نەهامەتیەی تۆ بۆ هۆزەکەی خۆتت هێناوە کەس ناناسم لەنێو عەرەب دا شەڕی وای بۆ هۆزەکەی خۆی هێنابێ پاشان (أبو لهب) سەیری قوڕەیشی کردو وتی: دەست و زمانی بگرن و دەمی داخەن پێش ئەوەی هەموو عەرەب ببێتە دوژمنتان، پێغەمبەر(ﷺ) بێ دەنگ بوو پاشان پێی فەرموون ئەگەر تێرتان خواردووەو دەتانەوێت بڕۆن، فەرموون بڕۆن.

دیارە پێغەمبەر(ﷺ) نەیویست بانگەوازەکەی بەشەڕ دەست پێبکات باشە (أبو لهب)ی دوابراو بۆ ئەو هەڵوێستە ناشرینەی بەرانبەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) نواند، خۆ پێشتر زۆر ڕێزی دەگرت وخەزوری دوان لەکچەکانی پێغەمبەر بوو(ﷺ)، لەڕاستیدا تەنها هۆکار ئەوەبوو بەلێکدانەوەی کولی کەبانگەوازی محمد قوڕەیشیان لێهەڵدەگێڕێتەوەو دواجار بەرژەوەندیەکانی خۆیشی دەکەوێتە مەترسییەوە...



پێغەمبەر(ﷺ) لەمیانەی ئەو بانگهێشتەی کەبۆ ٤٥کەسی نزیکی خۆی کرد لەهۆزی (هاشم) نەیتوانی ئەوەی مەبەستیەتی باسی بکات، بێگومان زۆر لەم جۆرە دیمەنانە لەنێو ژیاننامەی ئەم نازدارەدا دەبینین کەنەیتوانیوە بەئامانجەکانی خۆی بگات بەڵام هەرگیز نائومێدو بێهیوا نەبووە ئەمەش پەندو ئامۆژگاریەکی گرنگە کەدەبێت هەڵوێستەی لەسەربکەین، هەر کاتێك دووچاری شکست بووین بێهیوا نەبین، کاتێك خوای گەورە خۆشەویستەکەی دەخاتە بارودۆخێکی لەو جۆرەوە، هەتابزانین بەزۆریی هەوڵەکانمان ئەگەر چی هەندێکیان شکست خواردووبن لەئاکامدا سەرکەوتن دەستە بەردەکەین (إن شاء الله) ... کەواتە هەوڵی بەردەوام لەگرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنەو خوای گەورە دەستبەرداری ئاینەکەی نابێت.

جارێکی تر پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی دایەوەو ٣٠کەس لەپیاوان و ژنانی هۆزی (هاشم)ی کۆکردەوە ئەمجارەیان چاوەڕوانی نەکرد هەتا خواردنەکەیان دەخۆن بەڵکو لەکاتی نان خواردندا دەستی کرد بەئاخاوتن و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد، جا لەنێو عەرەبدا ئەم شێوازە لەوتار نەبیستراو بوو، پاشان فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر لەگەڵ هەموو خەڵکی درۆ بکەم لەگەڵ ئێوە درۆ ناکەم ، ئەگەر هەموو خەڵکی دەستخەڕۆبکەم، ئێوە دەستخەڕۆ ناکەم، بەوخوایەی هاوەڵی نیە، من پێغەمبەری خوام بەتایبەتی بۆ ئێوە، ئینجا بۆ هەموو خەڵکی بەگشتی، سوێند بەخوا دەمرن وەك چۆن دەخەون زیندوودەبنەوە وەك چۆن لەخەو هەڵدەستن، لەبەرامبەر کردەوەکانتاندا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت، لەوەودواش یان بەهەشتی هەتاهەتایی دەستەبەردەکەن ئەگەر موسڵمان بن، یاخود دۆزەخی هەتاهەتایی ئەگەر یاخی بن، ئەی هۆزی (هاشم) خۆتان لەئاگر بپارێزن، ئەی نەوەی(عبدالمطلب)خۆتان لەئاگر ڕزگاربکەن، ئەی (عباس)



خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگاربکەن، ئەی (صفیە) خۆت ڕزگاربکە لەدۆزەخ، ئەی(فاطمە)ی کچی(محمد) تۆیش خۆت ڕزگاربکە لەئاگر من هیچ دەسەڵاتێکم نیە لای خوا بۆ ڕزگاریتان، پاشان سەیرێکی تری (فاطمة)ی کردو فەرمووی ئەی (فاطمة)ی کچی (محمد) چیت دەوێت لە ماڵ و سامانم داوای بکە بە لام دڵنیابە هیچم لای خوا بۆ ڕزگاریتان پێ‌ناکرێت.

(عباس)و (حمزە) بێ دەنگ بوون،.. (أبو طالب) گەورەی هۆزی (هاشم) وتی: ئەوەی فرمانت پێ‌کراوە بەردەوام بە لەسەری هەتا لەژیاندابم پشتیوانیت لێ دەکەم و ڕێگە نادەم زیانت پێ‌بگات ... (ابو طالب) ئەم کارەی کرد وەك وەفایەك بۆ وەسیەتەکەی(عبدالمطلب)ی باوکی... (أبو لهب)وەڵامی دایەوەو وتی: ئەمە بەڵایەو پێش ئەوەی خەڵکی دەستی بگرێت، ئێوە خۆتان دەستی بگرن!!!

پاشان (أبو طالب) وتی: وتەیەکەو وتومە بەخوا تالە ژیاندابم پشتیوانی دەبم هەرچی لەو کۆڕەدابوو بێ‌دەنگ بوو بەڵام سەریان بادەدا ....!! بەمەش پێغەمبەر (ﷺ) خۆی خستە پەنای(ابو طالب)ی مامیو هۆزی(هاشم) لەکاتێکدا ئاتاجی پەنای کەس نەبوو، چونکە خوای گەورە خۆی بەڵێنی پارستنی دابوو، بەڵام ئەم کارەی کرد هەتا ئێمە فێرببین هۆکارەکان بۆ سەراپای کارەکانمان بگرینە بەر ...

دوای ئەوە فەرمووی: ((کێ لەئێوە باوەڕ بەوەدەکات کە بۆ من هاتووە، (( هەردوو حەمزەو عباس سەری خۆیان داخست، (أبو طالب) وتی: ( من لەسەر ئاینی (عبدالمطلب)م ناتوانم لێی جیاببمەوە، بەم شێوەیە یەك کەس لەپیاوان وژنانی (بەنی هاشم) باوەڕیان پێ‌نەهێنا، (علی) مێرد منداڵ نەبێ دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی من ئەبمە شوێنکەوتەی ئەو ئاینەی هێناوتە، هەموو دانیشتوان بەم قسەیەی (علی ) پێکەنین، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەستی درێژکردو

فەرمووی: دەست لەسەر دەستم دابنێ، ئەویش دەستی خستە سەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ).

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پەنای هۆزەکەی بەدەست هێنا بانگەوازەکەی ئاشکراکرد ئەوەبو چووە سەرکێوی صەفاو بانگی‌کرد، ئەی نەوەی(عبدالمناف)، ئەی نەوە(عدی)، ئەی نەوەی(فهد)... خەڵکی کۆبوونەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خەڵکینە ئەگەر ئێستا هەواڵتان بدەمێ سوپایەك لەپشتی ئەو شاخەوەیەو دەیەوێت هێرشتان بێنێتە سەر بڕوام پێ‌دەکەن؟! هەموو وتیان: هەرگیز درۆمان لێ نەبینیویت! ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)بەو پەڕی هێزەوە وەستاو فەرمووی: من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە، هاتووم ئاگادارتان دەکەم گەر گوێڕایەڵم نەبن سزایەکی سەخت چاوەڕێتان دەکات...(أبو لهب)هەڵیدایەو وتی: دەك لەناوچیت ئەمڕۆ بۆ ئەم قسانە ئێمەت کۆکردەوە. پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی نەدایەوەو لەسەر بەرزاییەکەی (صفا) دابەزی ئەوسا خوای گەورە ئەم سورەتەی ڕەوانە کرد: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ* مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ* سَيَصْلَى نَاراً ذَاتَ لَهَبٍ﴾ (المسد /٣).

دوای ئەم ڕوداوە پێغەمبەر(ﷺ) بەناو شەقامەکانی مەککەدا دەڕۆیشت و خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئیسلام ودەیفەرموو: بڵێن لاإله إلا الله سەرفراز دەبن، لاإله إلا الله بڵێن دەچنە بەهەشتەوەو لاإله إلا الله بڵێن هەموو عەرەب دەکەوێتە دەستتان عەجەمیش دەبێتە یاوەرتان ... هەموو بانگەشەکانی مژدە ئامێزبوون باسی دۆزەخی نەکرد، بەڵکو بانگەوازەکەی بەهاندان و تامەزرۆکردن دەستی پێ‌کرد نەك بەتۆقاندن ....

ئیتر لەوکاتەوە قورەیش کەوتنە دژایەتی بانگەوازەکەی، ژمارەی موسڵمانان نەدەگەیشتە (٢٠٠)کەس لەبەرانبەرەوە قورەیش لەنێوان ٢٥تا٣٠ هەزار کەسدا



بوون... سەرەتا وەڵامەکانی قورەیش گاڵتەکردن بوو، پاشان ئازاردانی دەروونیو جەستەیی بوو، لەوەودوا هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی ... ئەمەش قۆناغبەندی ئازاردان بوو... جارێك پێیان دەوت شێتە، جارێك دەیانوت ساحیرە یاخود فاڵچیو شاعیرە... پاشان ویستیان لەسەریەك وشە رێك بکەون تا لەناو هەموو عەرەبدا پێی بڵێن ...

(ولید)ی کوڕی(مغیرە) دوای ئەوەی گوێی لەقورئان بوو گەڕایەوە لای قورەیش و وتی: وتەکانی شیرینیەکی تێدایە، تەڕو پاراوەو بەتوێکڵەو سەرەتاکەی بەرهەمدارە، بەڕاستی بەرەو پایەداری دەچێت و کەس بەسەریدا زاڵ نابێت، قورەیش دوای ئەم قسانە سەیرێکی (ولید)یان کردو وتیان: دیارە تەسلیمی بویت!! (ولید) خۆی لەحەق بەگەورەتر زانیو وتی نەخێر، جادوگەرە... بەمەش عەرەب لەسەرئەوە رێك کەوتن کەهەموو بڵێن جادوگەرە!! جا دەربارەی (ولید)ی کوڕی (مغیرە) ئەم ئایەتانە هات کەدەفەرموێت: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً* وَجَعَلْتُ لَهُ مَالاً مَّمْدُوداً* وَبَنِينَ شُهُوداً* وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيداً* ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ* كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيداً* سَأُرْهِقُهُ صَعُوداً* إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ* فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ* ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ* ثُمَّ نَظَرَ* ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ* ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ* فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ* إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ* سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾المدثر /١١-٢٦ )

ئیتر لەگەڵ (أبو لهب) جەنگی لەبەرامبەر پێغەمبەردا ڕاگەیاندو لەناو خەڵکیدا دەیوت محمد شێتە !!... دوای ئەوە (نضر)ی کوڕی(حارث)یان نارد بۆ وڵاتی فارس هەتا چیرۆك و بەسەرهاتی فارسەکان فێربێت، ساڵێکی خایاندو گەڕایەوە مەککە، هەرکاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست قسە بۆ خەڵکی بکات،



چیرۆك و بەسەرهاتی بیٚمانای دەگێڕایەوە تەنها بەمەبەستی شێواندنی بانگەوازەکەی پێغەمبەر(ﷺ)!!

لەوەش زیاتر تۆمەتباریان کرد بەوەی ئەلّقە لەگوێی بێگانەیە ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاؤُوا ظُلْماً وَزُوراً* وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ (الفرقان / ٤-٥) .

هەموو ئەو ماوەیە پێغەمبەر(ﷺ)بیٚ پەروا بە شەوو بەڕۆژ سەرقالّی بانگکردنی خەلّکی بوو، شەوگاریش هەلّدەستا تا بەرەبەیان، خاتوو (خدیجە) پێی دەوت: کەمێك ناخەویت! تۆ زۆر ماندویت!! ئەویش دەیفەرموو: کاتی خەو بەسەرچوو ئەی(خدیجە)... دوایئەوە خوای گەورە قورئانی نازلّ کردو داوای لەپێغەمبەر(ﷺ) کرد کەئەو ئەرکە لەسەر خۆی سوك بکات ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أَسَفاً﴾(کهف/٦). لەگەلّ هەموو ئەمانەدا گومان دروست کردن بۆ بانگەوازەکەی بەردەوام بوو پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر بەهێزو متمانەوە ڕوبەڕویان دەبوەوە، دیارە هێزی ڕاستیو ڕۆشنیی بانگەوازەکەی دوژمنانی دەسەوسان کردوەو بەتەواوی بێزارو بێتاقەتی کردوون... بۆیە تادەهات ئازاردانی قورەیش لەسەر خۆیو بانگەوازەکەی زیاد دەبوو پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر سوردەبوو، چونکە دلّنیابوو کەبەرپرسە لەگەیاندنی ئەو پەیامە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی. هەربۆیە بەتەواوەتی سوربوو لەسەر گەیاندنی بانگەوازەکەی.پێغەمبەر(ﷺ) لەناو گەلەکەیدا بەڕاستگۆییو دەست و داوێن پاك دەناسرا تەمەنی گەیشتبووە ٤٣ سالّ و کەسایەتی خۆی پاراستبوو لەهەموو لەکەیەك.

دەیزانی کەخۆشەویستی خواوەندی (الرحمن)ەو گەورەی بونەوەرە ...



لەگەڵ هەموو ئەمانەدا خەڵکانێکی سوك و ڕیسوا لەبێباوەڕانی قوڕەیش گاڵتەیان بەخۆیو بانگەوازەکەی دەکرد ...ئاخۆ کاریگەری ئەو حاڵەتانە چۆن بوبێ لەسەر دڵ و دەروونی؟! کار لای قوڕەیش گەیشتە ڕادەیەك منداڵ و کەم فامەکانیان کۆدەکردەوە هەرکە پێغەمبەر(ﷺ) بەهەرشوێنێکدا تێدەپەڕی گاڵتەیان پێدەکردو (( شێتە شێتە )) شوێنی دەکەوتن قورئان ئەو دیمەنەی بۆ وێنە گرتوین ﴿وَقَالُواْ يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ﴾ (الحجر/ ٦) .

ئەم دەنگ وباسە بەجۆرێك بڵاوبوەوە کاتێك هۆزە دورەکانی دەورروبەر لەوەرزی حەجدا دەهاتن بۆ مەککە یەکتریان لێئاگاداردەکردەوەو دەیانوت: خۆتان بەدووربگرن لەکابرا شێتەکەی قوڕەیش!! ...لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر(ﷺ) هەر بەئارام بوو بەڵکو پێشەنگی ئارامگران بوو نەیدەهێشت ئەم جۆرە گوفتارو ڕەفتارانە کاریگەریی لەسەر دروست بکەن بەڵکو بەردەوام بوو... بێگومان دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەوسنورەشدا نەوەستا ... (أم جميل) خێزانی (أبو لهب) دڕك وخاشاکی پیسی دەهێناو لەسەر ڕێگاکەی پێغەمبەر(ﷺ) فڕێیدەدا، بەڵام ئەو ئارامیو هێوری خۆی لەدەست نەدەدا، چونکە باوەڕدار هەمیشە هێورو دڵنیایە، سەیری دەکردن و دەیفەرموو: (( ئەی خەڵکی قوڕەیش ئەمە چۆن دراوسێیەتیەکە کەی دراوسێیەتی وادەبێت؟!)) پێغەمبەر(ﷺ) دەیزانی کێ ئەم کارە دەکات بەڵام جنێودەرو نەفرینکەر نەبوو بۆیە لەسەر ئەو کردەوەیەی (أم جميل) قورئان دابەزی ﴿وامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ* فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾ (المسد/٤-٥) .

جا (أم جميل ) ئافرەتێکی هارو بێچاوو ڕوو بوو کاتێك زانی قورئان دەربارەی هاتووە، بەردێکی گرت بەدەستیەوەو هەواڵی پێغەمبەری پرسی، پێیان



وت لەکەعبەیە بەرەو ئەویێ کەوتەڕێ لەوکاتەدا پێغەمبەرو(أبوبکر) پێکەوە دانیشتبوون پرسیاری کردو وتی: (محمد) لەکوێیە؟! دیاربوو پێغەمبەری نەدەبینی، چونکە خوای گەورە کوێری کرد لەئاستیدا، (أم جميل ) دەیوت: دەڵێن قسەی پێ وتم، سوێند بەخوا ئەگەر ببینم ئەم بەردەی پیا دەدەم، پاشان چەند دێرێك هۆنراوەی وت لەدژی پێغەمبەر(ﷺ)هاوەڵان زۆر پێیان ناخۆش بوو..بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)دڵخۆشی دەدانەوە.

ڕۆژێکی پێغەمبەر(ﷺ) (طەواف)ی (کعبە)ی دەکرد هەندێك لەنەفامەکانی قوڕەیش لەنزیکیەوە بوون دەستیان کرد بەپێکەنین و گاڵتە کردن، بەشێوازێك خەریك بوو بە پشتا دەکەوتن !! کاتێك گاڵتەکردنیان گەیشتە ڕادەیەك لە سنور دەرچوو پێغەمبەر(ﷺ) وەستاو سەیرێکی کردن کەهەمووی عیزەت و هێزو دڵقایمی بوو پاشان فەرمووی: ئەی هۆزی قوڕەیش: ئەگەر کۆڵ نەدەن سەرتان بەبڕین دەچێت!! ئیتر هەموو ترسان و بێدەنگ بوون و وتیان(أبا القاسم) بەردەوام بە لە (طواف)ەکەتدا ئێمە تۆمان هەربە نەرم ونیان ناسیوە ...

ئەوکاتە ئەم ئایەتانە هاتەخوارەوە :﴿ إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُواْ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ* وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ* وَإِذَا انقَلَبُواْ إِلَى أَهْلِهِمُ انقَلَبُواْ فَكِهِينَ* وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلَاء لَضَالُّونَ* وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ*فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُواْ مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ* عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ* هَلْ ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ (المطففين / ٢٩-٣٦) ..

کەچی گاڵتەکردنی بێباوەڕان تا دەهات زیادی دەکردو پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئازار بەدڵی دەگەیشت، قورئان وێنەی هەندێ لەو دیمەنانەمان بۆ باس دەکات: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ﴾ (الأنعام /٣٣)

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ* فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ﴾ (الحجر/٩٧-٩٨) .

﴿مَا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ (فصلت/٤٣).

لەگەل هەموو ئەو هەلّوێستە ناشرین ونامەردانەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەر سوربوو لەسەر بانگەوازو بۆ یەك سات دودلّی‌و نائومێدی زەفەری پیّ‌نەبرد، بەهیچ شێوەیەك گالّتەکردن و گوفتاری هەرزەو نەفامان کاری نەکردە سەری، پاشان ویستیان بەم گوفتارە بیّ‌جێیە، ئازاری خۆی‌و خاتوو (خديجه)بدەن بۆیە وتیان: کوڕی نابێت و وەجاخ کوێرە!! لەو سەردەمەشدا بەلای عەرەبەوە نەنگ بوو ئەگەر پیاو کوڕی نەبێت، ئەوەی ئەم قسەیەی لەنێو قوڕەیشدا برەوپێدا (وائل)ی کوڕی (عمرو) بوو ...

زۆر دلّیان بەوە خۆش بوو چونکە وایان دەزانی بەمردنی خۆی پەیامەکەیشی کۆتایی دێت چونکە کوڕێکی لەدوا بەجیّ نامێنێت!!

خاتوو (خديجه) بەم قسانە زۆر دلّی تەنگ دەبوو، ئەوە بوو سورەتی (الكوثر) نازلّ بوو پاشان سورەتی ﴿الشرح﴾ .

بێگومان ئەو سورەتانە بۆ دلّنەوایی‌و دلّ دامەزراندنی زیاتری پێغەمبەر(ﷺ) بوو. ئەو پێغەمبەرەی کەناوی پیرۆزی لەسەر دەروازەکانی بەهەشت بەخەتی نورین نوسراوە(محمد رسول الله) ...

بێگومان لەسەروبەندی ئەو بارودۆخە ناهەموارەدا ژمارەی ئەوانەی دەهاتنە نێو بازنەی ئیسلامەوە تا دەهات ڕوو لەزیادی بوون.

ئازاردانی قورەیش بەگشتیو(أبو لهب) بەتایبەتی لەسنورێکدا نەدەوەستا، (أبو لهب) فرمانی کرد بەدوو کوڕەکەی هەر دوو کچەکەی پێغەمبەر(ﷺ) خاتوو (رقیه)و(أم کلثوم) تەلاّق بدەن، وای دەزانی بەوکارانەی دەتوانێت فشاری دەروونی بخاتە سەر پێغەمبەر(ﷺ)تاساردی بکاتەوە لەکاری پیرۆزی، پێغەمبەر(ﷺ) گرنگیەکی تایبەتیدا بە(أبو جهل) ئایەتی قورئانی بۆ دەخوێندەوەو بانگی دەکرد بۆ (ئیسلام) رِۆژێك (أبو جهل) بەپێغەمبەر(ﷺ)ی وت ئەی (محمد) ئەتەوێت لای خوا شایەتیت بۆ بدەم کە تۆ پەیامەکەت گەیاندووە؟! دلّنیابە شایەتیت بۆ دەدەم، بەلاّم وازم لێبێنە، ئەگەر تۆم بەراستگۆ بزانیایە شوێنت دەکەوتم!! دوای رۆیشتنی (أبو جهل) ئەم ئایەتانە نازلّ بوو : ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ﴾ (الأنعام /٣٣)

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ* فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ﴾ (الحجر/٩٧-٩٨) .

دوای ئەوەی (ابو جهل) بەپێغەمبەری وت ئەگەر بەراستگۆت بزانم شوێنت دەکەووم بەلاّم تۆ درۆزنی، کەچی بەوەی تەنیشتی وت: سوێند بەخوا چاك دەزانم راستگۆیە، بەلاّم ئێمەو نەوەی (عبد المطلب) لەکۆنەوە ئەوە لەنێوانماندایە: نانیان دا، نانمان دا، میراوییان کرد، میراویمان کرد، یارمەتی خەلّکیان دا، ئێمەش یارمەتی خەلّکیمان دا، هەتا وتیان: پێغەمبەر لەئێمەیە، سوێند بەخوا لەداخدا هەرگیز باوەڕیان پێ‌ناکەم.

کەواتە بڕوا نەکردن بەپێغەمبەر لەترسی لەدەست دانی بەرژەوەندیە دنیاییو پلەوپایە کۆمەلاّیەتیەکانە ....

بەڵێ ئازاردان بەردەوام بوو، ئەوەی زۆر ئازاری پێغەمبەری دەدا(ﷺ)(عقبە)ی کوڕی(معیط)بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەتەنیشت کەعبەوە نوێژی دەکرد کاتێك چووە سوژدەوە (عقبە) هات عەباکەی‌دا بەسەر پێغەمبەرداو پێچای لەگەردنی‌و ویستی بیخنکێنێت. هەندێك لەبێ‌باوەڕان لەتەنیشت کەعبەدا بوون بەو دیمەنە پێدەکەنین پاشان (عقبة) چوو ورگی وشترێکی مردارەوەبووی هێناو کردی بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) ئەویش هەر لەکڕنوشدا مایەوە هەتا خاتوو (زینب)ی کچی هات و لەسەری لابردو دەستی کرد بەگریان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئا لەو حاڵەدا دڵخۆشی دەدایەوەو دەیفەرموو: (( مەگری کچی خۆم خوای گەورە باوکت سەردەخات ))، ڕۆژێکی تر پێغەمبەر(ﷺ) بەناو مەککەدا دەڕۆیشت کوتوپڕ وردە لمیان ئاڕاستەی ڕوخساری پیرۆزی کردو چاوەکانی پڕبوون لەوردەلم ، بەپەلە خۆی گەیاندەوە ماڵەوە خاتوو (فاطمة ) بینی دەستی‌کرد بەگریان، پێغەمبەر(ﷺ) دڵی دەدایەوەو دەیفەرموو: (( مەگری کچی خۆم خوای گەورە باوکت سەردەخات))...
ڕۆژێکی تر (عقبە)ی‌کوڕی(معیط) کەپێشتر نمونەی هەڵوێستی ناپوختی باسکرا، گوێ‌بیستی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بەجۆرێك کاری تێکرد خەریك بوو موسڵمان بێت، (أبو جهل ) لەسەفەردا بوو بۆ نەگبەتی ئەو گەڕایەوە (عقبة) پێی وت: دەمەوێت موسڵمان بم (أبو جهل) هاورێی دڵڕەش و خراپی وتی: دیدارو گوفتارم لەتۆ حەرام بێت هەتا نەچیت تف نەکەیتە ناوچەوانی(محمد)( ﷺ).. ئەونەفامەش بەقسەی (أبو جهل) ی کردو ئەوکارە ناشرین و قێزەونەی ئەنجامدا . ئەوسا لەسەرو ئاسمانەکانەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ



سَبِيلاً* يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَاناً خَلِيلاً*لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءنِي﴾
(الفرقان ٢٧-٢٩)

ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لەپاڵ كەعبەدا لەسوژدەدا بوو(أبو جهل) بینیو وتی: پێ ئەنێمە سەرگەردنی و دەم وچاوی لەخۆڵدا نغرۆ دەكەم، كاتێك لەپێغەمبەر (ﷺ) نزیك بۆوە كەوتە لەرزین و زۆر بەخێرایی لێی دوركەوتەوە، پێیان وت ئەوە چیتە؟ وتی: لە نێوان من و(محمد)دا چاڵێكی پڕ ئاگرم بینی هەر لێی نزیك بومایەتەوە دەسوتام ...

پێغەمبەر(ﷺ)باسی ئەو ئازارانەمان بۆدەكات كە لەلایەن قوڕەیشەوە لەو ڕۆژگارە سەختانەدا ڕووبەڕووی بوەوە: (كەس وەكو من ئازار نەدرا، كەس وەكو من لەبەر خوا نەترسێنرا، كەس وەكو من برسی نەكرا، ٣٠ شەووڕۆژ گوزەری دەكرد لەسكی من و (بلال)دا بەقەد پارویەكی تیانەبوو، جگە لەو تۆزە نانەی كە(بلال) لەژێر باڵیدا بۆی دەهێنام....

لەنێو ئەو كەش وهەوای ئازاردانەدا (أعرابی)یەك هاتە نێو مەككەو بەدوای (أبو جهل)دا دەگەڕا، (أبو جهل) ماوەیەك بوو پارەی ئەو پیاوەی لابوو بۆی نەدەگێڕایەوە، كابرای (أعرابی) وتی: كێ دەتوانێت پارەكەم لە(أبو جهل) بۆ وەربگرێتەوە، هەندێ لەكاڵ فامەكانی قوڕەیش ویستیان گاڵتەی پێبكەن بۆیە وتیان: ئەو پیاوەی لەتەنیشت كەعبەوە نوێژدەكات دەتوانێت، مەبەستیان گاڵتەكردن بوو بەپێغەمبەر(ﷺ) (أعرابی)یەكە چوو چاوەڕوانی كرد هەتا پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژەكەی بوەوە ، ئەوسا داوای لێ كرد كەپارەكەی لە(ابو جهل) بۆ وەربگرێتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ)یەكسەر هەستاو هەردوكیان ڕۆیشتن بۆماڵی (أبو جهل) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پارەی ئەم پیاوەت لایە؟ (أبو جهل) وتی: بەڵێ، فەرمووی: بۆی بگێڕەوە!! (أبو جهل) یەكسەر چوو پارەكەی هێناو

دایە دەست کابرای (أعرابی)، کاتێك بێباوەڕانی قورەیش ئەو هەڵوێستەیان لە(أبو جهل) بینی سەرسام بوون، بۆیە وتیان: ئەوە چیبوو وابەئاسانی لەبەرامبەر (محمد)دا داماوبویت، (أبو جهل) وتی: ((ووشترەنێرێکم لەپشتی محمدەوە بینی ئەگەر پارەکەم نەگێڕایەتەوە دەیخواردم))، شایانی باسە پێغەمبەر(ﷺ)ئەو کابرایەی لەوکاتەدا بانگ نەکرد بۆ ئیسلام، بەڵکو لەکاتێکی تردا پەیامی خوای پێڕاگەیاند ...

هاوەڵان لەسەر ئەم ڕێگایە ڕۆیشتن و بانگەوازیان ئاشکرا کرد. (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) لەپاڵ کەعبەدا وەستاو وتی: سوێند بەخوا دەبێت قورئان بەسەر (قریش)دا بخوێنم ، ڕۆیشت و دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی (الرحمن) کاتێك بێباوەڕان گوێیان لێبوو، لێی کۆبونەوەو کەوتنە لێدانی ئەویش کۆڵی نەداو دوای تاوێك دەستی پێکردەوە، دواجار زۆر بەتوندی لێیاندا لەسەر ئەو حاڵەتە مایەوەو بێباك بوو لە لۆمەی لۆمەکاران... پێغەمبەر( ﷺ) فەرمووی ئیتر کۆڵ بدەو وازبهێنە، (عبدالله ) وتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خ وا(ﷺ)هیچ کاتێك بەقەد ئەمجارە لەبەرچاوم سوك و ڕیسوا نەبوون .....

ڕۆژێك چەند کەسێك لەبێباوەڕانی قورەیش لەپێغەمبەر( ﷺ) کۆبونەوەو کەوتنە ئازاردانی، یەکێك پاڵی پێوە دەناو ئەوی تریان ڕایدەکێشا هەتا (أبو بکر)هات و پاڵی پێوەنان و دوریخستنەوەو دەیوت: کەی ڕەوایە، هەربۆیە پەلاماری دەدەن چونکە دەڵێت پەروەردگارو خوای من (الله)یە، ئەوسا وازیان لەپێغەمبەر(ﷺ) هێناو پەلاماری(أبوبکر)یاندا، (عقبة) بەنەعلەکانیدەیماڵی بەڕوخساری پیرۆزی (أبوبکر)دا وشین ومۆری کردەوە، هەتا تەواو ئاوسا، (أبو بکر) یش هەتا هێزی تێدابوو بەرگری لەخۆیکردو پاشان بورایەوە، ئەوسا



وازیان لێهێناو هەندێکیان وایان زانی مردووە، بۆیە هەڵیان گرت و بردیانەوە بۆماڵەوە سێ شەووڕۆژ بەئازارێکی زۆرەوە دەتلایەوە، کاتێك هاتەوە هۆش خۆی وتی: چییان لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)کرد، دایکی وتی: ئیتر بەسە واز لە(محمد) بێنە، (أبو بکر) وتی: سوێند بەخوا نەدەخۆم ونەدەخۆمەوە هەتا لەهەواڵی دڵنیا نەبم، بڕۆ بۆلای (فاطمة)ی‌کچی(خطاب) کەلەوکاتەدا موسڵمان بوونی شاراوەبوو، پێ‌ی بڵێ: چیان لەپێغەمبەری خوا کرد ...

کاتێك دایکی پرسیاری لە(فاطمة )کرد، (فاطمة) وتی(محمد ) ناناسم بەڵام ئەگەر دەتەوێت دێم لەگەڵتا ...

کاتێك هات و پەرێشانی(أبو بکر)ی بینی: زۆردڵی سوتا، (أبو بکر) فەرمووی چیان لەپێغەمبەری خواکرد(ﷺ) وتی: (الحمد لله) باشە، سەلامەتە أبوبکر فەرمووی: سوێند بەخوا نەدەخۆم ونەدەخۆمەوە هەتا نەمبەنە خزمەتی، ئەوسا ناچار هەڵیانگرت و بردیان بۆخزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) کە (ابو بکر)ی بینی زۆر بەزەیی پیادا هاتەوەو خێرا باوەشی کردو دڵی بۆی سوتاو چاوە پیرۆزەکانی ئەسرینی وەران بۆهاوەڵی خۆشەویستی، ئەویش وتی: خەمت نەبێت یا رسول الله ، شوکر باشم تەنها ڕوخسارم ئازاری پێگەیشتووە.

لەولاشەوە(بلال)ڕوت کرابوەوە لەسەر لمی گەرم لەبەرخۆر لێ‌ی دەدرا لەگەرمای هاویندا زرێی ئاسنی لەبەرکرابوو بەقامچی دور لەهەستی مرۆیی بێبەزەییانە لێی دەدرا،بەردێکی گەورەشیان خستبوو سەرسنگی کەبەچەند پیاوێك هەڵنادەگیرا تابڵێت: باوەڕم بە(لات وعوززا )هەیە ئەویش ڕەزای خوای‌لێبێت هەر دەیووت : أحد ً ،أحدٌ ...أحدٌ، أحد ... (زبیر)ی کوڕی (عوام ) لەلایەن مامیەوە لەژوورێکدا زیندانی‌کرابوو جارجارە مامی حەسیرێکی دەسوتاند، خەریك بوو لەتەنگە نەفەسیدا دەخنکا، هەرچەندە تەمەنی شانزە



سالان بوو بەلام هەردانی بەخۆداگرت و لەئاینەکەی پەشیمان نەبوەوە، هەرچەند بەهۆی ئەو دوکەڵەوە توشی نەخۆشی سنگیش بوو ....

نمونەی تر لەئازاردانی هاوەلان خانەوادەی یاسر بوو، (سمیە)ی کچی (خیاط )دایکی یاسر تەمەنی لە٦٠ساڵ تێپەڕیبوو خۆیو یاسری کوڕیو هاوسەرەکەی هەژارو دەست کورت بوون و وایان لێهاتبوو ئیتر بەرگەی ئەشکەنجەیان نەدەگرت، هەندێجار پێغەمبەر(ﷺ)بەلایاندا تێدەپەڕیو دەیفەرموو: ئارام بگرن ئەی خێزانی یاسر وادەی ئێوە بەهەشتە ...

ڕۆژێك (أبو جهل) هەندێ قسەی ناڕەوای بە(سمیە)وت، ئەویش تفێکی ئاڕاستەکرد ئەوسا ئەو نەفامە بەشێوەیەکی دڕندانە ڕمەکەی چەقاند بەسکیداو شەهیدی کردو، بووبە یەکەم شەهید لە ئیسلامدا ..

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بەلای (عمار)دا تێپەڕیو (عمار)وتی: تاکەی ئاوادەمێنینەوە؟! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوایە لەخانەوادەی یاسر خۆشبە! کاتێك (ابو جهل) کوژرا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی (عمار)ی کردو فەرمووی: مژدەبێت خوای گەورە تۆڵەی دایکتی سەندەوە!!

بۆ(خباب)یش پشکۆی ئاگریان دەهێناو دەیانکرد بەهەر چوار لای لاشەیدا هەتا بەچەوری لەشی پشکۆکان دەکوژانەوە!!

ڕۆژێکی چووە خزمەت پێغەمبەر( ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆنزامان بۆ ناکەیت؟ بۆ داوای پشتیوانیمان لەخوا بۆناکەیت! پێغەمبەر(ﷺ) بەم قسەیەی (خباب) ڕوخساری سور هەڵگەڕاو فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە خەڵکانێك هەبوون پێش ئێوە بەمشار دایاندەهێنان و لاشەیان لەناوەڕاستدا دەکرد بەدووکەرتەوە، کەچی لەدینی خۆیان پەشیمان نەدەبوونەوە



سوێند بەخوا ئەم دینە دەگاتە ئامانجی خۆی بەجۆرێك کاروانچی لە(صنعاء)وە دەڕوات بۆ(حضرةموت) لەخوا نەبێت لەکەسی دی ناترسێت بەڵام ئێوە پەلەدەکەن....

## موسڵمان بوونی (حەمزە) و ( عومەر) :

لەنێو ئەم کەشە پڕ غەم و ناسۆرەدا، لەژێرسایەی ئەشکەنجەو ئازاری لەتوانابەدەر (حمزه) دێت و ئیعلانی موسڵمان بوونی خۆیدەکات، (حمزه) ڕاوچی بوو، ڕۆژێك لەڕاو دەگەڕایەوە کەنیزەکێك بەرەوڕوی هات کەموسڵمان بوونی خۆی شاردبوەوە پێی وت: تۆ خەریکی ڕاوکردنیت و (أبو جهل )ئازاری برازاکەت دەدات!! کەوانەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت بۆ(کعبه) گەیشتە لای (أبوجهل) وپێی وت: لە(محمد)ی برازام دەدەیت لەکاتێکدا من لەسەر ئاینی ئەوم، کەوانەکەی بەرزکردەوەوکێشای بەسەریداو بەتوڕەییەوە وتی: ئازایت وەڵامم بدەرەوە؟! هاوەڵگەرێك پێی وت: (حمزه) هەڵگەڕایتەوە؟ وتی: ئەگەر دەتوانیت بمگێڕەوە؟! بەڵێ من شایەتی دەدەم (محمد) پێغەمبەری خوایەو کەسیش ناتوانێ ڕێگەم لێبگرێت،(أبوجهل)وتی: وازی لێبێنن زۆر بەخراپی تانەم لەبرازاکەیدا.... دوای ئەوە (حمزه) یەکسەر چوو بۆخزمەت پێغەمبەر(ﷺ)باسەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) پێشوازییەکی گەرمی لێکرد، لەوێش شایتمانی دووبارە کردەوەو وتیشی: شایەتی دەدەم کەتۆ ڕاستگۆیت بڕۆ دینەکەت ئاشکرا بکە ومن لەخزمتدا دەبم ...

لەکۆتایی ساڵی پێنجەم و سەرەتای ساڵی شەشەمی هاتنی پەیامی ئیسلامدا (عمر)ی کوڕی (خطاب)یش موسڵمان بوو، (عمر) پێشتر کەسێکی زۆر توندوڕەق بوو لەبەرامبەر موسڵمانناندا، پێغەمبەر(ﷺ) بەهەر شوێنێکدا

بڕۆیشتایە بۆ بانگ کردنی خەڵکی بۆ ئیسلام شوێنی دەکەوت و خەڵکی لێ دور دەخستەوەو نەیدەهێشت پەیامەکەی بگەیەنێت، بەجۆرێك ئەوەندە بەدوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێکی پێ وت: بەشەوو بەڕۆژ وازم لێ ناهێنیت!!!

ئازاردانی (عمر) بۆموسڵمانان گەیشتە ڕادەیەك لەسنور دەرچوو بوو، کەنیزەکێکی موسڵمانی هەبوو، هەموو جارێك ئەوەندەی لێدەدا هەتا بەتەواوی ماندوو دەبوو بۆئەوەی لەئیسلام پاشگەزی بکاتەوە بەلاَم بێسود بوو.

ڕۆژێك چوو(طواف )ی ( کعبة)بکات، سەیری کرد پێغەمبەر(ﷺ) لەوێەو نوێژ دەکات، بێئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەستی پێبکات لێی نزیك بوەوە، پێغەمبەر(ﷺ) سورەتی (الحاقە)ی دەخوێند، (عمر) لەدڵی خۆیدا وتی ئەم پیاوە(شاعیر)ە، پێغەمبەر(ﷺ)گەیشتە ئایەتی ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلاً مَا تُؤْمِنُونَ﴾ (الحاقة / ٤١)، ئینجا لەدڵی خۆیدا وتی: فاڵچییە پێغەمبەر(ﷺ)ئایەتی (٤٢)ی خوێندەوە ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ﴾ پاشان لەبەرخۆیەوە وتی: ئەی کەواتە ئەم وتانە چین؟ پێغەمبەر(ﷺ)ئایەتی ﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الحاقة/٤٣) ی خوێندەوە.

جا ئەو ئایەتانە کارکردی هەبوو لەسەر دڵ ودەروونیو دیاربوو دەیویست زیاتر لە ئیسلام تێبگات.

ڕۆژێك ئافرەتێکی موسڵمانی بینی کەلوپەلەکەی هەڵگرتبوو ئەڕۆیشت (عمر)

پێیوت: بۆ کوێ دەچیت؟ بۆپاراستنی ئاینەکەم لەدەست ئێوە ڕادەکەم ... (عمر)وتی: بۆتۆش باش نیە خاکی خۆت بەجێبهێڵی، ئافرەتەکە هەستیکرد



خەریکە (عمر) دڵی نەرم دەبێت بۆیە بۆ مێردەکەی باسکرد، کەچی مێردەکەی وتی: سوێند بەخوا (عمر) موسڵمان نابێت هەتا گوێدرێژەکەی (خطاب) موسڵمان نەبێ، ئەوەندە نائومێد بوو لێی وای لێهات بیرکردنەوەو ئەندێشە لەهزری (عمر)دا گێنگڵێان دەدا، خەریك بوو قەناعەتی بەئیسلام دەهێنا (شیطان)یش دوودڵی بۆ دروست دەکرد بەجۆرێك سەرسام بوو نەیدەتوانی ڕاستی لەناڕاستی جیابکاتەوە، بۆیە ڕۆژێك بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر پێغەمبەر(ﷺ)، وەشەهیدی بکات!! (شیطان)یش هانیدا بۆیە شمشێرەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت، توشی پیاوێکی موسڵمان بوو، پرسی: بۆکوێ کوڕەکەی (خطاب)؟! وتی: دەچم (محمد) دەکوژم، ئەویش لەبەر پێغەمبەر وتی: ئەڕۆیت بۆ کوشتنی (محمد)و واز لەخوشکەکەت دەهێنیت!! ئیتر پێغەمبەری بیرچووەوەو ڕۆیشت بۆماڵی (فاطمة)ی خوشکی، لەوێ (خباب)ی‌کوڕی(أرت) سورەتی (طه)ی فێردەکردن، (عمر) لەدەرگایدا، (خباب) خۆی شاردەوە،(عمر) خۆی کرد بەژووورداو وتی: ئەو دەنگە دەنگەچی بوو، خوشکەکەی وتی: هیچ!! کەچی پەلاماری (سعید)ی‌کوڕی( زید)ی هاوسەریدا، پاشان (فاطمة)ی خوشکی ویستی دەستی بگرێت و وتیشی: (عمر) باشە ئەگەر حەق و ڕاستی لەغەیری دینی تۆدا بێ، نابێت؟! (عمر) توڕەبوو دەستی ماڵی بەڕوخساری خوشکەکەیداو خوێن لەدەمی هات و ئەوبەشە قورئانە لەدەستی کەوتە خوار، (عمر) وتی: ئەمە چی‌یە؟ (فاطمة)ی خوشکی وتی: تۆ پیسی دەستی لێ‌مەدە هەتا خۆت نەشۆیت (عمر) لەناکاو بێ‌دەنگ بوو بڕیاری‌دا بچێت خۆی بشوات ئینجا دوای خۆشتن کەوتە خوێندنەوەی سورەتی (طه) ﴿ طه* مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى* إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَى* تَنزِيلاً مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى* الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى* لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَى*



وإن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى* اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْأَسْمَاء الْحُسْنَى﴾(طه/١-٨)

ئینجا وتی: (محمد) لەکوێیە؟!(خباب) کەخۆی شاردبوەوە وەلآمی دایەوە وتی: لە ماڵی (أرقم)ە، ئەویش ڕۆیشت بۆ ماڵی (أرقم)و لەدەرگایدا، نزیکەی ٤٠ کەسێك لە پیاوو ئافرەت لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ)خەریکی وانەخوێندن بوون، (بلال) وتی: (عمر)ە، (حمزە) وتی: دەرگاکەی بۆ بکەنەوە ئەگەر بۆ چاکە هاتبێ بەخێر بێت، ئەگەر بۆ شەڕیش هاتبێ ئەوا وازی لێبهێنن بۆ خۆم ... (بلال) دەرگاکەی کردەوە (عمر) هاتەژوورەوە، (حمزە) توند گرتیو ڕایوەشاند (عمر) لەسەرچۆك دانیشت، (حمزە ) بەدەنگی بەرز پێی وت: ئەی کوڕی (خطاب) کاتی ئەوە نەهاتووە موسڵمان بیت!(عمر)یش زۆر بەتاسەوە وتی: (أشهد أن لاإله إلا الله وأنك رسول الله ) دەنگی (الله أكبر) لەناو موسڵمانان بەرز بوەوە... ئینجا (عمر) سەیرێکی پێغەمبەری(ﷺ) کردو وتی: ئێمە لەسەر حەق نین؟! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، وتی: ئەوی ئەوان لەسەر ناهەقی نین؟! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، پاشان وتی:دەی کەواتە بۆخۆمان بشارینەوە!! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی بەڕای تۆ چی بکەین، (عمر ) وتی: ئەڕۆینەدەرەوەو بەئاشکرا هاواردەکەین(لاإله إلا الله) پێغەمبەر(ﷺ) بەزەردەخەنەوە سەیرێکی (عمر)ی کردو فەرمووی: تۆ بەڕاستی (فاروق)یت،واتە: خوای گەورە بەتۆ حەق و ناحەق لەیەك جیادەکاتەوە، ئەوسا موسڵمانان بەدوو ڕیز هاتنە دەرەوە، ڕیزێك (حمزە) لەپێشیانەوە بوو ڕیزەکەی تر(عمر)... چونە (کعبە)و (طواف) یان کرد، ئەم دیمەنە هەموو قوڕەیشی ترساندو کەس لەماڵی خۆی نەهاتەدەر ...



دوای ئەوە (عمر) ڕۆیشت بۆ لای(أبو جهل)و لەدەرگای داو وتی: (أبا الحكم) زانیوتە، وتی: چی؟! (عمر) وتی: (أشهد أن لاإله إلا الله وأن محمدا رسول الله )... (أبو جهل) وتی: ڕۆژەکەت لێ تێکدام، ئیتر دەرگاکەی داخست پاشان چوو بۆ لای(أبو سفیان)و هەمان هەواڵی بۆ ئەویش باسکرد، ئەویش وتی: ڕۆژەکەت لێ تاڵ کردم و دەرگاکەی داخست!! پاشان ڕۆریشت بۆلای (جميل)ی کوڕی(معمر) کەکابرایەکی زۆربڵێو چاتۆڵبازبوو، نهێنی کەسی نەدەپاراست، (عمر) پێی وت: نهێنیەکت لاباس دەکەم، وتی: چی‌یە؟ وتی (أشهد أن لاإله إلا الله وأن محمدا رسول الله )، هەردوای ئەوە (جميل) ڕایکردو بەدەنگی بەرز هاواری دەکردو دەیوت: (عمر)هەڵگەڕاوەتەوە، (عمر)یش بەدوایەوە دەیوت: درۆدەکات، بەڵکو موسڵمان بووم... پاشان ڕۆیشت بۆ(كعبه)وکەوتە تورەکردنی هاوەڵگەران و توشی شەڕێکی دەستەویەخە بوو هەتا تەواو ماندوو بوو، یەکێك لەوانەی لەویدا بوون گرتی‌و پەنجەی خستە سەر هەردوو چاوی‌و پێی‌وت: پێیان بڵێ لێم دووربکەونەوە ئەگینا هەردوو چاوت کوێر دەکەم، ئەوانیش وازیان لێهێنا، پاشان ڕۆیشتەوە بۆماڵی خۆیان وبەخانەوادەکەی ڕاگەیاند کە: من موسڵمان بووم قسەتان لێم حەرام بێت هەتا شایەتمان دەهێنن (عبدالله)ی کوڕی وتی: بابە، من ساڵێکە موسڵمان بووم، بە(عبدالله) ی وت: ئەی بۆ منت بانگ نەدەکرد بۆ ئیسلام باوکت تیادەچوو ئاوا بمایەتەوە!!

### کۆبونەوەی هاوەڵان لە ماڵی ( أرقم):

دوای ئەو ماوەیەی کەهاوەڵان تێیدا دوچاری ئازاری زۆر بوون کاری کردبووە سەر ورەیان، چونکە ئەوانیش وەك هەرکەسێکی تر ئادەمیزادن وتوانایان سنوردارە، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بەرزکردنەوەی ورەیان هەنگاوێکی نوێی

دەست پێکرد، ئەویش بە کارکردن لەسەر پاڵفتەو ڕۆشنکردنی باوەڕیان و فراوانکردنی تێڕوانینی فیکریان ... بۆیە لەماڵی (أرقم)ی کوڕی(أرقم)دا کۆی کردنەوە ئەمەیش لەبەر چەندهۆیەك:

١-(أرقم) تەمەنی لە ١٨ساڵیدا بوو، لەبەرئەوە بەخەیاڵی قورەیشدا نەدەهات موسڵمانان لەماڵی گەنجێکدا کۆببنەوە تەمەنی ١٨ساڵ بێت...

٢-(أرقم) کەسێکی ناسراو نەبوو، لەبەرئەوە لەلایەن (قریش)ەوە جێگەی چاودێری کردن نەبوو بۆیە کۆبونەوەکانیشیان لەوماڵەدا ئاشکرا نەدەبوو ...

٣-شوێنگەی ماڵی(أرقم) لەناوەڕاستی هۆزەکەی خۆیدابوو لەبەرئەوە (قریش) نەیان دەوێرا قەیرانێك بۆ خۆیان بسازێنن ....

لەگرنگترین ئاکامەکانی ئەو خولە ڕاهێنانەی کەلەنێوان ٢٠٠تا٣٠٠موسڵمان تیایدا بەشداریان کردو٣ساڵی خایاند ئەوەبوو کەسەلماندیان بوونەتەکەسایەتیەکی بەئارام و بوێر، هەروەها فێری کاری بەکۆمەڵ و بەرخۆدان وخۆشەویستی لەبەرخواو بۆخوابوون بوون و بوونە خاوەنی تێڕوانین و ئاسۆی بیریان دەربارەی جیهان و دەورووبەریان فراوان بوو، جگە لەفراوانبوونی دیدی سیاسیو ئیداریو بەڕێوەبردن... قورئان ئەم مانایەی لەڕوانگەی سورەتی (العصر)دا بەرجەستەکردوە: ﴿وَالْعَصْرِ* إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ* إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾العصر

واتە:سوێند بەزەمانە* سوێند بەکاتی عەسر* بەڕاستی ئادەمیزاد لەزەرەرمەندیو خەسارەتمەندیدایە*بێجگە لەوانەی باوەڕیان هێناوەو



کاروکردەوەو چاکەکانیان ئەنجامداوەو ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە کەهەمیشە پابەندی حەق بن، لەبەرئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووە تاهەمیشەو بەردەوام، خۆگرو ئارامگربن.

لەو رۆژگارەدا جەنگێك لەنێوان فارس و رۆمەکاندا رویداو فارسەکان تێیدا سەرکەوتن، هاوەڵان نیگەران بوون بەسەرکەوتنی فارسەکان چونکە ئاگر پەرست بوون حەزیان بەسەرکەوتنی رۆمەکان دەکرد چونکە خاوەنی ئاینی ئاسمانی بوون، هەربۆیە سەرەتای سورەتی (الروم) هاتە خوارەوەو دڵخۆشی موسڵمانانی دایەوە بەوەی کەرۆمەکان نۆرەیان دێتەوە ﴿الم*غُلِبَتِ الرُّومُ* فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ* فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ*بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾(الروم١-٤)

واتە: رۆمەکان تێکشکێنران*لەنزیکترین ونزمترین ولاتیاندا، بەڵام لەئاییندەدا رۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە* لەچەند ساڵێکدا، هەمووکارو فرمانێك تەنها بەدەستی خوایە، لەوەوپێش و لەوەودوایش، جا ئەورۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ و شاد دەبن*بەسەرکەوتنی خوا، هەرکەسێك یان هەر دەستەیەك ئەوزاتە بیەوێت سەری دەخات، هەرئەوخوایەش خاوەنی دەسەلاتی بێ سنورەو زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە.

پاشان بەیەکجار سورەتی (الأنعام)هاتە خوارەوە کەحەفتا هەزار فریشتە لەخزمەتیدا بوون کەتواناو دەسەلات و گەورەیی خوای باڵادەستی نومایان کردبوو لەچەندەها ئایەتیدا...

﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ﴾(الأنعام/٥٩)



واتە: کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنی‌یەکان بەدەست خوایەو لای ئەوە.

﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾(الأنعام/١٦٢)

واتە:بلّێ بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەکانی و هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆخوای پەروەردگاری جیهانیانەوە.

﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾(الأنعام/٦١)

واتە:ئەو زاتە دەسەلاتی بێسنورە بەسەر بەندەکانیدا.

هەروەها سورەتی (هود)یان خوێند کەباس لەبەسەرهاتی پێغەمبەران دەکات ...

شایانی باسە پێغەمبەر(ﷺ) وەك ئەمەکێك بۆ(أرقم) خانویەکی بۆ کڕی لەمەدینە.

لەم کاتە پڕ لە ناهەموارەیەدا سورەتی (المطففین)دادەبەزێت ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ*الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ*وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ*أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ*لِيَوْمٍ عَظِيمٍ﴾(المطففین/١-٥)کەسەرەتاکەی هەڕەشەیە لەوانەی ستەمی ئابوری دەکەن، ئینجا لەوانەی ستەمی عقیدەی دەکەن وسەرئەنجامی ستەمیان، پاشان مژدەیە بەچاکان بەنازونیعمەتی هەمەجۆر کۆتاییەکەشی دیمەنی گاڵتەجاڕی خوانەناسان دژ بەئیمانداران دەخاتەڕوو، پاشان ئەودیوی شانۆکە نیشاندەدات چونکە دیمەنەکە پێچەوانە دەبێتەوە لەکاتێکدا ئیمانداران لەبەهەشتدا سەیری کافران دەکەن کەلەدۆزەخدا گیریان خواردوە .



**سیاسەتی دانوستان :**

کاتێك قورەیش بۆیان دەرکەوت ئازاردان سودی نیەو موسڵمانان بەرامبەری ئارام دەگرن و دەرەنجام هەرخۆیان زیانیان پێ دەگات بۆیە سیاسەتێکی نوێیان گرتەبەر ئەویش دانوستان کردن بوو ...

جارێك لەگەڵ (أبو طالب) داو جارێکیش لەگەڵ خودی پێغەمبەر(ﷺ)دا ..

جارێك بەتەماع خستنەبەرو فریودان بەماڵ وسامان، بێگومان خوای گەورەو دانا دەیویست پێغەمبەران وهاوەڵان تاقیبکاتەوە بەهەموو جۆرە بەڵاو ئازاردان و دانوستان و فریودان و...

ئەوانیش تادەهات سورتر دەبوون لەسەربیروباوەڕەکەیان تاببێتە گەورەترین و پیرۆزترین ئەزموون بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، هەتا کۆتایی دنیا.

دانوستان لەنێوان قورەیشی دەوڵەمەند تەنها بەماڵ وسامان، بەڵام هەژار لەفیکرو بیروباوەڕدا، لەلایەك، وەموسڵمانانی هەژار لە ماڵ وساماندا، بەڵام دەوڵەمەند بەبیروباوەڕو پەیامیان ...

پێش دانوستان کردن لەگەڵ موسڵماناندا لەگەڵ(أبو طالب)دا دانوستانیان ئەنجامداوپێیان وت یان دەبێت برازاکەت ناچار بکەیت بانگەوازەکەی بوەستێنێ یان بیدەرە دەستمان و دەستبەرداری ببە بۆ ئەو مەبەستە یەکەم وەفدی(قریش) بریتی بوون لە((أبو جهل)و (أبوسفیان)(عتبه)کوڕی(ربیعه)و (شیبه)ی کوڕی (ربیعه)و(ولید)ی کوڕی(مغیره)و(عاصم)ی کوڕی(وائل)و(أبوالبختري)کوڕی (هشام)...شایانی باسە هیچ ئەنجامێکی نەبوو، ئەوساجارێکی تر گەڕانەوەو بۆ جارێکی تر (عماره)ی کوڕی(ولید)یان لەگەڵ خۆیان هێنا کەقۆزترین



لاوانیقورەیش بوو لەڕووی نەژادو جوانییەوە بە(أبو طالب)یان وت: (عمارە)ت دەدەینێ (محمد)مان بدەرێ ... (أبو طالب) وتی: دادپەروەر نەبوون لەگەڵما، کوڕەکەی خۆتانم ئەدەنێ بۆتان بەخێو بکەم و برازاکەم ببەن بیکوژن!! سوێند بەخوا شتی وانابێت!!

(أبو طالب) هەستیکرد قورەیش دەیانەوێت پێغەمبەر(ﷺ)بکوژن بۆیە (عقیل)ی کوڕی نارد بەشوێن پێغەمبەر دا(ﷺ)وبەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوەو پاشان وتی: برازای خۆم ئاگات لەخۆت و لەمنیش بێت و دوچاری کارەساتێکم مەکە بەرگەی نەگرم ..

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی بەخوا مامە ئەگەر خۆر بخەنە سەر شانی ڕاستم و مانگ بخەنە سەر شانی چەپم تاواز لەم کارەبهێنم وازی لێناهێنم هەتا خوا سەری دەخات یان لەپێناویدا دەچم ... پاشان پێغەمبەر(ﷺ)دڵی پڕ بوو...ئینجا (أبو طالب) وتی: (والله) تا من مابم ناتوانن زیانت پێبگەیەنن، تا ئەو ڕۆژەی لەنێو خاکدا دەمنێژن، دەست بەکاربە هیچ نیگەران مەبە مژدەببەخشەو دڵنیابە لەلایەن ئێمەوە.

دوای شکستی دانوستانەکەیان لەگەڵ (أبوطالب)دا ڕۆیشتن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)و (عتبە)ی کوڕی(ربیعە)یان نارد بۆ لای ئەویش لە پاڵ کەعبەدا دانیشتبوو پێی وت: برازای خۆم تۆ لەخۆمانیت و خاوەن نەژادو ڕەچەڵەکێکی ناسراووگەورەیت، تۆ ئاینێکت هێناوە لەوەو پێش شتی وانەبووە، دوبەرەکیت بۆ پێش هێناوین پەرتەوازەت کردوین، جیاوازیت لەنێوان باوك و کوڕدا دروستکردووە، هەندێك پێشنیار دەخەمە بەردەستت سەیریان بکە، بەڵکو هەندێکیان قبوڵ بکەیت: ئەگەر ماڵ وسامانت دەوێت ئەوا لەپارەی خۆمان



ئەوەندەت بۆ کۆدەکەینەوە تا لەهەمووومان دەوڵەمەندتر بیت، خۆ ئەگەر مەبەستت پلەو پایەیە، ئەوا دەتکەینە گەورەی خۆمان و هیچ کارێك بەبێ ڕاوێژی تۆناکەین، خۆ ئەگەر پاشایەتیت دەوێت ئەوا دەتکەینە پاشای خۆمان، ئەگەر جنۆکەیش دەستی لێوەشاندویت ئەوا پزیشکت بۆپەیدا دەکەین هەتا چاك دەبیتەوە، خۆ ئەگەر دەتەوێت ئافرەتێکی جوانت دەست بکەوێت ئەوا جوانترین کچی قوڕەیشت بۆ داوا دەکەین... (ئەوساکە (ولید) بێ دەنگ بوو ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی تۆ گوێ لەمن دەگریت؟! ئیتر دەستی کرد بەخوێندنی بەشێك لەئایەتەکانی سورەتی (فصلت)﴿ حم* تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ* كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ* بَشِيراً وَنَذِيراً فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ* وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ* قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ* الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ* إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ* قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ* وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء لِّلسَّائِلِينَ* ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ* فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظاً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ* فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾(فصلت-١٣)

ئەوسا (عتبة) دەستی نایە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)وتی: لەبەرخاتری خزمایەتی داوات لێ دەکەم بێدەنگ بیت!! پاشان گەڕایەوە بۆ ناو قوڕەیش ... کاتێك (أبو سفيان)، (عتبة)ی بینی ڕوخساری گۆڕاوە وتی: دەنگ و باس

چی‌یە؟! وتی: گوێم لەوتەیەك بوو لەوەوپێش گوێم لەشتی وانەبووە، (واللە) نە(شعر)بوو نە(سحر)، جوان و ڕازاوەو سەروبندار، بەردەوام بڵند دەبێتەوەو هیچ شتێك بەسەریدا بڵند نابێتەوە.. هەمان قسەی(ولید)ی بۆ دووبارەکردەوە پاشان وتی: خەڵکی(قریش): ئەمڕۆ بەقسەم بکەن پاشان سەرپێچیشم بکەن (گوێ نادەمێ )، واز لەو پیاوە بهێنن چی‌دەوێت بابیکات (واللە) کارێکی زۆر گەورەی لەئەستۆدایە، ئێوە ئەگەر وازی لێ بهێنن ڕەنگە لەدەست عەرەب ڕزگاری نەبێت، ئەوسا ئێوە ڕزگاردەبن، خۆ ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوت ئەوا دەسەڵاتی ئەو دەستەڵاتی ئێوەشە، کەچی وتیان: بەخوا سیحری لەتۆش کردا!!

پاش ئەوە حەوت لەگەورە پیاوانی قوڕەیش هاتن کە نوێنەری (دار الندوة) بوون کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بینینی پێی فەرموون:

بۆئەوە نەهاتووم دەست بەسەر ماڵ وسامانتاندا بگرم، نەهاتووم ببمە دەسەڵاتدار، هەروەها نامەوێت ببمە پێشەواو سەرۆکتان، بەڵکو نێردراوی خوام بۆئێوە، ئەگەر قبوڵی بکەن ئەوا ئەگەر هەرچیەکتان لەژێر سایەی مندا دەستکەوت ئەوا بەشی خۆتانە لەدنیادا، ئەگەر هەر باوەڕیش ناکەن ئارام دەگرم هەتا خوای گەورە لەنێوانماندا فەرمانی خۆی ئەنجامدەدا ...

یەکێکیان پرسیارێکی فێڵبازانەی کردو وتی: باشە، ئەی (محمد) ئایا تۆ چاکتری یان باوکت؟! ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) بیفەرمووایە باوکم ئەوا پێی دەوت ئەی کەباوکت باشترە بۆ وازت لەئاینەکەی هێناوە، خۆ ئەگەر بفەرمووێت خۆم ئەوا ئەم قسەیەیان هەڵدەگرت و بەناو خەڵکدا دەیانگێڕا تاناوی بزڕێنن ...

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی نەدایەوەو بەردەوام بوو لەسەر خوێندنەوەی سورەتی (فصلت) بەدەم ڕۆیشتنەوە.



**پێک هاتن :**

دانوستانەکان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا بۆیە پەنایان بۆ پێك هاتن برد ئەوەبوو پێشنیاریان کرد، ئەو ماوەیەك خواکەی ئەوان بپەرستێت و ئەوانیش ماوەیەك خواکەی ئەو دەپەرستن بۆ ئەمەیش خوای گەورە سورەتی(الکافرون)ی ڕەوانەکرد. ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ* لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ* وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ* وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ* وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ* لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾

واتە: ئەی(محمد(ﷺ)) بلێ: ئەی کۆمەڵی بێباوەڕو خوانەناسان*من هەرگیز ئەوشتانەی کەئێوە دەیپەرستن نایپەرستم*ئەوەی ئێوە پەرستووتانە من هیچ کات نایپەرستم*ئێوەش، ئەوزاتەی من دەیپەرستم نایپەرستن* کەواتە دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆخۆم)

پاشان دورخستنەوەی هەژارانیان پێشنیارکرد، تا لەکۆڕی تایبەتدا گوێی بۆبگرن، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەم پێشنیارەیان بیری کردەوە بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی ڕەوانەکرد ﴿وَلَوْلاَ أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً﴾(الإسراء/٧٤)

واتە:خۆئەگەر ئێمە تۆمان پایەدارو دامەزراو نەکردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت کەمێك بەلایاندا مەیل بکەیت وبەدڵی ئەوان بکەیت!!

هەروەها ﴿وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم﴾(الأنعام/٢٥)

واتە: نەکەیت ئەوانە دەربکەیت کەلەبەیانیان و ئێواراندا لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو مەبەستیشیان تەنهاڕەزامەندی ئەوە.

**پەیماننامەی ( الفضول ) :**

لەنێوەندی ئەم دانوستانانەدا پێغەمبەر(ﷺ)دەسپێشخەرییەکی کرد، فەرمووی ئەگەر قورەیش بانگم بکەن بۆ پەیماننامەیەکی وەکو (الفضول) ئەوا لەگەڵیاندا ئەنجامی دەدەم .. (الفضول) ئەوپەیماننامەیە بوو کەقورەیش مۆریان کرد لەسەر بەرگریو سەرخستنی ستەم لێکراوان لەپێش ئیسلامدا، دیارە پێغەمبەر(ﷺ)بەمە ویستی نامەیەك بگەیەنێتە (قریش) کە ئەکرێت خاڵی هاوبەش لەنێوانماندا هەبێت، دەنگ دابڕینمان لەگەڵ ئێوەدا بۆدوبەرەکی نیە، بەڵکو دەبێ ئێوە چاك لەوە حاڵی بن کە: ئێمە ئامادە نین واز لەبیروباوەڕو بنەما جێگیرەکانمان بهێنین، بێگومان هەربەم هەڵوێستەوە پێویستە موسڵمانان لەهەموو شوێن وسەردەمێکدا خەڵکی لەسەر ئەو بنەمایە بانگ بکەن ...

**کۆچی یەکەمی موسڵمانان :**

دوابەدوای ئەم هەڵوێست و هەوڵانە قورەیش ئازاردانی هاوەڵانی زیادکرد بەتایبەتی ئافرەتان، ڕووبەڕووی ئازاری زۆر توندبوونەوە وەك دایکی (عبیس) کە (أبو جهل) زۆر بەتوندی ئەشکەنجەیدا هەتا چاوی کوێربوو... هەروەها چەندین گەنج ولاوی وەك (مصعب)ی کوڕی(عمیر) سێ ساڵ لەماڵی باوکیدا زیندانی کرا، بەڵام هەر بەچاکی لەگەڵیدا ڕەفتاری کردو پەشیمانیو ساردی ڕووی تێنەکرد، هەروەها (طلحە)ی کوڕی(عبیداللە) کەتەمەنی ١٥ساڵ بوو دایکی بەناو بازاڕەکاندا ڕایدەکێشاو لەماڵەوە دەیبەستەوە ولێیدەدا، کاتێك پرسیارکرا بۆچی دایکی وا لەو کوڕە دەکات؟! کوڕەش هیچ ناڵێت!! وتیان: ئایینەکەی بەوشێوەیە فەرمانی پێدەکات !!

بەڵێ تادەهات بەلا لەسەر موسڵمانان زیادی دەکرد بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا کۆچ بکەن بەرەو حەبەشەو فەرمووی: پاشایەکیان هەیە کەس لەژێر سایەیدا ستەمی لێناکرێت.... ئەمەش ئاماژەیە بەوەی پێغەمبەر(ﷺ)ئاگاداری بارودۆخی ولاتانی دەوروبەربووە....پێش ئەوەی موسڵمانان کۆچ بکەن هەردوو سورەتی (مریم) و(الكهف) نازڵ بوو، ئەم دوو سورەتە وەك پاڵپشتێکی مەعنەوی وابوون بۆ کۆچبەران، دیارە ئاینی مەسیحی لەوکاتەدا لەنێو خەڵکیدا بوونی هەبوو، سورەتی (مریم)یش باس لە لەدایك بوونی (عیسا)ی کوڕی (مریم) دەکات و ڕاستی ئەو پێغەمبەرە نازدارە ڕوون دەکاتەوە، بەوەی کەنە خوایەو نەکوڕی خوایە!!

سورەتی (الكهف)یش باس لەبەسەرهاتی یارانی ئەشکەوت و چەند بەسەرهاتی تر دەکات، بەتایبەت ئەو لاوە بەڕێزانەی کە لەبەرخاتری پاراستنی بیروباوەڕیان ڕویانکردە ئەشکەوت، هەروەها گەڕانی موسا پێغەمبەر بەشوێن زانستداو ئەمسەرو ئەوسەرکردنی زەوی لەلایەن(ذو القرنين )ەوە بۆ چاکسازیو نەهێشتنی ستەم و چەندەها باسی تر.

کۆچ کردن بۆ حەبەشە بەدوو قۆناغ ئەنجام درا، لەقۆناغی یەکەمدا ١٨کەس کۆچیان کرد لەقۆناغی دووەمدا ٨٥کەس، لەکاتێکدا ژمارەی موسڵمانان بەگشتی نزیکەی ٣٠٠کەس بوون، بەمەش سێیەکی موسڵمانان بەرەو حەبەشە کۆچیان کرد ... لەنێوکۆچ کردواندا (عثمان)و(جعفر)ی کوڕی (أبو طالب)و (عبدالرحمن )ی کوڕی (عوف)و (زبير)کوڕی(عوام)و (أم حبيبه)ی کچی (أبوسفيان ) هەبوون کەزۆربەیان دەیانتوانی لەمەککە دا بمێننەوە، بەلام بەکۆچیان مەککەیان لەرزاند، چونکە لەنێو کۆچکردواندا (أم حبيبه)ی کچی(أبو سفيان) هەبوو، هەتا هەژاران وا هەست نەکەن کەپێغەمبەر(ﷺ)



دەست بەوانەوە دەنێ، بەڵکو تەنانەت فەرمانیدا کە(رقیە)ی کچی لەگەڵ( عثمان)دا کۆچ بکات، موسڵمانان ١٥ساڵ لەحەبەشەدا مانەوە هەتا ئەوکاتەی جەنگی خەیبەر ڕویداو موسڵمانان لەمەدینەدا بەتەواویی پایەداربوون ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی نەدان لەحەبەشە بگەڕێنەوە هەتا سەرکەوتنی خەیبەر بەدەست هات، بۆ ئەوەی هێزوتوانایموسڵمانان لەیەك شوێندا کۆنەبێتەوە بەو مەبەستەی ئەگەر موسڵمانان دوچاری کارەسات وشکست بوون هەموویان تیانەچن.. دوای گەڕانەوەی موسڵمانان لەخاکی حەبەشە، پێغەمبەر(ﷺ) لەمەدینە پێشوازییەکی گەرمی لێکردن و (جعفر)ی کوڕی(أبو طالب)ی لەئامێزگرت و فەرمووی ( واللە نازانین بە کامیان دڵخۆش بین، بەرزگارکردنی (خیبر) یان بەگەڕانەوەی (جعفر).

جا ئەوکاتەی موسڵمانان گەیشتنە خاکی حەبەشە قوڕەیش تەواو توڕەبوون و ئارامیان لێبڕا، لەبەرئەوەی جەنگ گوازرایەوە بۆ دەرەوەی مەککە بۆیە (عمرو) کوڕی(عاص) و (عبداللە)ی کوڕی (ربیعە) یان نارد (عمرو) پاشای دەناسی (عبداللە)یش پیاوێکی دەوڵەمەند بوو دیارییەکی زۆری لەگەڵ خۆیدا برد...

(عمرو) گەیشتە لای (نەجاشی)و پێی وت: جەنابی پاشا: ئەمانەکۆمەڵە هەرزەو کاڵفامێکی وڵاتی ئێمەن، دایك و باوکیان بۆ ڕاکردنیان پەرێشانن، بۆیە ئێمەیان ناردووە هەتا لەگەڵ خۆماندا بیانگێڕینەوە بۆ ناویان و ئەوان باشتر ئەزانن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن ...

هەندێ لەنزیکان و داورودەستەی وتیان: ڕاست دەڵێت!!

بەڵام نەجاشی وتی: بەخوا هەتا گوێیان لێنەگرم کاری واناکەم... ئەوەبوو (جعفر)و موسڵمانانی هاوڕێی بانگ کرد ... (نەجاشی )وتی: پێیان ڕاگەیاندووم وازتان لەئاینی خۆتان هێناوەو شوێن ئایینەکەی منیش نەکەوتوون و هاتونەتە وڵاتەکەشمانەوە چی ئێوەی هێناوەو ئەم ئاینە نوێیە چیە ئێوە شوێنی کەوتوون!!

(جعفر) هاتە پێشەوەو وتی: ئێمە گەلێکی نەفام بووین، خەریکی بتپەرستی بووین، خواردنی مردارەوەبومان دەخواردو لەگەڵ یەکتردا خراپ بووین، هاموشۆی یەکترمان نەدەکردو دەنگمان لەیەك دادەبڕی، بەهێزەکانمان لاوازەکانیان دەچەوساندەوە، لەسەر ئەم ڕەوشت و مامەڵانە مابنەوە هەتا پیاوێك لەخۆمان هات کەڕەچەڵەك ونەژادی لەنێوماندا ناسراوو بەناوبانگەو بەکەسێکی ڕاستگۆو ئەمیندارو داوێن پاك ناسراوە.

فەرمانمان بەڕاست وێژیو ئەمانەت پارێزیو ڕاگرتنی پەیوەندی خزمایەتیو جوان ڕەفتاری لەگەڵ دراوسێدا پێدەکات، هەروەها بەدڕەوشتیو درۆو خواردنی ماڵی هەتیوی لێ قەدەغە کردوین بەڵام هۆزەکەمان هێرشیان بۆ هێناین و ئەشکەنجەیان داین و ستەمیان لێکردین و ژیانیان لێتاڵ کردین، بۆیە پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمووی بڕۆن کۆچ بکەن بۆ(حبشە ) پاشایەکیان هەیە کەس لەژێر سایەیدا ستەمی لێناکرێت.... ئەوەتا ئێمەش هاتوینەتە وڵاتەکەت و ئێوەمان هەڵبژارد بەوئومێدەی لەژێرسایەی تۆدا ستەممان لێنەکرێت ...

ئینجا نەجاشی وتی: هیچت پێیە لەو پەیامەی کەپێغەمبەرەکەتان بۆی هێناون؟! ئەوسا(جعفر) یەکسەر دەستی بەخوێندنی ئەم ئایەتانەی سورەتی (مریم) کرد﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَاناً شَرْقِيّاً* فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً* قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّاً* قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَاماً زَكِيّاً* قَالَتْ أَنَّى



يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيّاً* قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْراً مَّقْضِيّاً* فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَاناً قَصِيّاً* فَأَجَاءهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْياً مَّنسِيّاً* فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيّاً* وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً* فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْناً فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَداً فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيّاً* فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئاً فَرِيّاً* يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيّاً* فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيّاً﴾ (مريم/١٦-٢٩)

واتە:ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لەقورئاندا باسی بەسەرهاتی مەریەم یادبکە، کاتێك کەنارگیری کرد لەکەس وکاریو شوێنێکی لەڕۆژهەلاتی (بيت المقدس) هەلبژارد (بۆخواپەرستی)* ئینجا لەنێوان خۆیو ئەواندا پەردەیەکی ڕایەل کرد ئێمەش جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆلای وەکو بەشەرێکی تەواو* مەریەم وتی: بەڕاستی من پەنادەگرم بەخوای میهرەبان لەتۆ ئەگەر کەسێکی بەتەقواو لەخوا ترس بیت*جوبرەئیل وتی: دلنیابە من تەنها نێردراوی پەروەردگاری تۆم، تامندالێکی خاوێنت پیبەخشم* مەریەم وتی: جاچۆن من مندالم دەبێت، لەکاتێکدا هیچ بەشەرێك توخنم نەکەوتووەو داوێن پیسیش نەبووم*جوبرەئیل وتی: ئەو قسانەی تۆ ڕاست و دروستن، بەلام ئەوە بڕیاری پەروەردگارەو دەفەرموێت: ئەو کارە لای من ئاسانە، بۆئەوەی بیکەمە نیشانەو موعجیزەیەك بۆ خەلکی، هەروەها ڕەحمەتێکی تایبەتیش بێت لەلایەن ئێمەوە، ئیتر ئەو کارەش بڕیاری لەسەر دراوەو بڕاوەتەوە* دەستبەجێ مەریەم سکی پڕبوو، بەرەو شوێنێکی دوور ڕۆیشت* ئینجا

ژانی منداڵبوون گرتی‌و بردی بۆلای قەدی دارخورمایەك، دەیوت: خۆزگە پێش ئەم حاڵەتە بمردمایەو وەك شتێکی بێ‌نرخ فەرامۆش بکرامایە* ئەومنداڵەی لەداوێنی بەربوەوە بانگی کردو وتی: دایەگیان خەفەت مەخۆ، ئەوەتە پەروەردگارت بە بەردەمتدا جۆگەلەیەکی جاری کردووە*ئەو دارخورمایەش کەمێك ڕابوەشێنە خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێنێت*ئینجا لەو خورمایە بخۆ، لەو ئاوەیش بخۆرەوە، خەمیشت نەبێت، ئەگەر کەسێکت لەخەڵکی بینی‌و (پرسیاری لێ‌کردی)، ئەوە بەئیشارەت تێی بگەیەنە پێی بڵێ: بەڕاستی من بڕیارمداوەو نەزرم کردووە کە بەڕۆژووبم بۆ خوای میهرەبانم، لەبەرئەوە ئەمڕۆ من هەرگیز قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم*ئەوسا مەریەم منداڵە نازداری خۆی لەباوەش گرت و بردی بۆلای خزم و کەس و کاری وتیان: ئەی مەریەم بەڕاستی کارێکی نالەبارو ئابڕووبەرت ئەنجامداوە* ئەی خوشکی هاروون تۆ نەباوکت کەسێکی خراپ و نەدایکیشت ئافرەتێکی داوێن پیس!!* مەریەم ئاماژەی بۆ ڕۆڵەی نازداری کرد، هەموو بەسەرسامیەوە وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵی ناوبێشکەدا دەکرێت.

بێگومان خوێندنەوەی ئایەتەکان لەلایەن (جعفر)ەوە کارکردی خۆی هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی نەجاشی، بۆیە سوێندی خوارد: کە ئەمەی خوێندنەوەو ئەوەشی کە حەزرەتی مەسیح هێناویەتی لەیەك دەڵاقەو سەرچاوەوە هاتوون.... لەبەرئەوە بڕۆن بەخوا هەرگیز ناتاندەمەوە دەستیان، پاشان بە(عمرو)ی وت: تۆیش بڕۆ بەخوا هەرگیز نایاندەمەوە دەستت ...

بێگومان ئەوەی کەڕویدا بەدڵی (عمرو)نەبو بۆیە بە(عبدالله)ی وت: بەخوا سبەینێ دەڕۆمەوە بۆلای نەجاشی‌و لەڕەگ وریشەوە هەڵیان دەکێشم .... (عبدالله) وتی: کاری وامەکە خزمایەتی هەیە با لە دەستی نەدەین

(عمرو) وتی: بەخوا هەرئەیکەم: بۆ سبەینێ (عمرو) ڕۆیشتەوە بۆلای نەجاشی وپێی وت: گەورەم ئەمانە سەبارەت بە(عیسی)ی کوڕی(مریم)قسەیەکی گەورەیان هەیە!! بۆیە دووبارە نەجاشی ناردیەوە بەشوێنیاندا، نەجاشی بە(جعفر)ی وت: پێم گەیشتووە پێغەمبەرەکەتان سەبارەت بە(عیسی)ی کوڕی(مریم) قسەیەکی گەورەی هەیە .... (جعفر)یش وتی: (عیسی) بەندەی خواو پێغەمبەریەتی‌و (بەوفەرمانە پیرۆزە دروستبووە کەخوا دای بەسەر (مریم)دا، نەجاشی بەگۆچانەکەی هێڵێکی بەسەر زەویدا کێشاو وتی : ((گەورەمان (عیسی) لەم هێڵە لای نەداوە، بڕۆن ئێوە تەواو ئەمینن هەرکەسێ قسەتان پێ بڵێ سزادەدرێت، بەخوا کێوێك لەزێڕ واز لێبێنم لام خۆشترە لەوەی یەکێك لەئێوە ئازار بدرێت))، پاشان دیاریەکانی دایەوە بەسەر(عمرو)دا ...

موسڵمانان ١٥ساڵ لەحەبەشەدا مانەوەو لەماوەی مانەوەیاندا کاری پیشەسازی پێستیان دەکردو بەنرخی هەرزان دەیانفرۆشت بەحەبەشیەکان بەوەش لای خەڵکی زۆر ڕێزدار بوون... لەمیانەی بوونی موسڵمانان لەحەبەشەدا، کودەتایەك دژی نەجاشی ڕویدا، نەجاشیش کەشتیەکی بۆ موسڵمانان ئامادەکردو پێی وتن: لەم کەشتیەدا بمێننەوە، ئەگەر سەرکەوتم وەرنەوە، ئەگەر شکستیشم خوارد بڕۆن... کاتێك نەجاشی سەرکەوت موسڵمانان گەڕانەوە بۆ حەبەشە، (أم سلمة) دەڵێت: لەدوای خۆشی چاوپێکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشییەکی ترمان نەدیوە وەك خۆشحاڵیمان بەسەرکەوتنی نەجاشی.



**پەنای خوا چاکترە :**

(عثمان)ی کوڕی( مضعون) لەپەنای (ولید)ی کوڕی(مغیرە)دابوو، (ولید) لەسەردارانی قوڕەیش بوو، لەبەرئەوە کەس نەیدەوێرا دەست درێژی بکاتە سەر ئەوکەسەی لەپەنای ئەودایە.

(عثمان) غەم وپەژارە دایگرت چونکە دەیبینیو دەیبیست براو خوشکانی لەسەر ئاینەکەیان ئەشکەنجەو ئازار دەدرێن و ئەمیش لەسایەی (ولید)دا سەلامەتە... بۆیە ڕۆیشت بۆلای (ولید)و پشتیوانیەکەی بۆ گێڕایەوە، (ولید) لێی پرسی هۆکاری نەویستنی پشتیوانیەکەم چییە؟! (عثمان) وتی: پشتیوانیەکم دۆزیوەتەوە لەتۆ چاکتر، (ولید) وتی بۆ لەپەنای من چاکتر هەیە.. (عثمان) وتی: بەڵێ پەنای خوای بالاّ دەست و شکۆمەند لەپەنای تۆ چاکترە!

پاشان ڕۆیشت بۆ(کعبە) و(لبید)ی شاعیری بینی شیعری دەوت، لەناو عەرەبدا باوبوو کەس شیعر بەشاعیر نابڕێت، ... (لبید) لەوکاتەدا دەیوت: هەموو شتێك جگە لەخوا بێبەهایە ...

(عثمان) وتی: ڕاست دەکەیت!!، (لبید) کەمێك بێدەنگ بوو، بەلاّم پێی ناخۆش بوو، پاشان (لبید) وتی : هەموو نیعمەتێکیش بەرەو نەمان دەچێت، (عثمان)وتی: نەخێر وانیە ، (لبید) بەلەسە بوو، ڕوو بەخەڵکەکە وتی: لەکەیەوە شاعیرەکان ئاوا سوکایەتیان پێدەکرێت! وتیان: وازی لێبهێنە لەپەنای (ولید)ی کوڕی (مغیرە)دایە، (عثمان) وتی: پشتیوانیەکەیم بۆ گێڕاوەتەوە... کاتێك گوێیان لەم قسەیە بوو، زۆر بەتوندی کەوتنە لێدانی، یەکێکیان دای لەچاوی و خوێنی لێهات، (ولید) سەیرێکی کردو وتی برازای خۆم تۆ لە پاڵ پەناو بەرگری



مندا سەرت بەرز بوو... (عثمان) وتی: چاوەکەی تریشم تامەزرۆیە وەکو ئەوی تریانی لێ بێت لە پێناوی خوادا.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ)چاوی (عثمان)ی بینی فوی کرد بەدەستیداو دەستی هێنا بەسەر چاوە بریندارەکەیدا و خوای گەورە شیفای بۆنارد....

## موسڵمان بوونی نەجاشی :

نەجاشی موسڵمان بوو بەڵام بەنهێنی، دوای ڕێکەوتننامەی (حودەیبیە) پێغەمبەر(ﷺ)نامەیەکی بۆ نارد هەرکە نامەکە گەیشتە دەستی دابەزی لەسەر تەختی پادشاییو بەهەواڵی سەرکەوتنەکانی موسڵمانان شادمان بوو، سوژدەی سوپاسگوزاری برد.

شایانی باسە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی کۆچی دوایی نەجاشی بیست لەناوهاوەڵاندا دانیشتبوو فەرمووی: هەستن بانوێژ لەسەر پیاوێکی صالح بکەین کە کۆچی دوایی کردوە، ئەو بەڕاستی خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەویست، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵاندا نوێژی (غائب)ی لەسەرکرد.

## لەنێو شیوی ( أبو طالب ) دا :

پێغەمبەر(ﷺ) ڕووبەڕووی چەندین هەوڵی تیرۆرکردن بوەوەکە لە ٧جار تێپەری، تەنها یەکێکیان باس دەکەین: ئەوکاتەی سەرانی قورەیش جگە لە(أبو طالب) لە(دار الندوة)کۆبونەوە بەمەبەستی پلان دانان بۆ تیرۆرکردنی... هەواڵەکە دزەی کردە لای(أبو طالب )، هەستیکرد پلانی ئەم جارەیان بڕیاری تەواوی لەسەر دراوە بەتایبەت کەهەستیکرد هەموویان لە( دار الندوة)دا بەشێوەی نهێنی کۆبونەوەیان ئەنجامداوە بێئاگاداری ئەم ... بۆیە هەر ئەو کاتە گەنجانی نەوەی (هاشم)ی کۆکردەوەو پارچە شیشێکی دایە دەست هەریەکەیان

و پێی وتن: شیشەکانی دەستتان لەژێر جلەکانتاندا بشارنەوەو هەریەکەتان بچنە پشت یەکێك لەسەردارانی قورەیشەوە، هەرکە ئاماژەیەکم کرد شیشەکانی دەستان دەربهێنن ...

لەڕۆژی دوایی‌دا (أبو طالب) دەستی پێغەمبەری خوای گرت و ڕۆیشتە ناو (حرم)و پاشان دەستی پێغەمبەری بەرزکردەوەو وتی: ئەی خەڵکی قورەیش ئەزانن ئەمەویٚ چی بکەم؟

وتیان: چی!؟ ئەوەبوو ئاماژەیەکی‌دا بەگەنجانی نەوەی (هاشم)، هەموویان شیشەکانی دەستیان دەرهێنا، ئەوسا ئیتر قورەیش حەپەساو نەیتوانی هیچ کارێك ئەنجام بدات!! ..

(أبو طالب) نەوەی (هاشم )ی‌کۆکردەوەو پلانێکی دانا لەپێناوی پاراستنی ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ).. پلانەکەیش ئەوەبوو: کە بۆ ئەوەی دەیەوێت پارێزگاری لەپێغەمبەر بکات(ﷺ) خانویەك لەشیوی (أبو طالب) دروست بکات ...

بەم کارە قورەیش کەوتە حاڵەتێکی نەخوازراوەوەو هەستی کرد زۆر خراپ تێکشکاوە بۆیە بڕیاریدا گەمارۆی شیوی (أبو طالب) بدات، گەمارۆکە زیاتر گەمارۆی‌یەکی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی بوو، ئەوەبوو مامەڵەی کڕین و فرۆشتن و ژن و ژنخوازی لەگەڵ نەوەی (هاشم) قەدەغەکرد، هەروەها بۆ ئەو مەبەستەش بڕیارنامەیەکیان نوسی‌و سەرجەم بازرگانەکان و سەرانی قورەیش مۆریان کردو لەناو (کعبە)دا هەڵیانواسی ...

(أبو جهل) بەمەش وازی نەهێنا بەڵکو دەستی کرد بەهاندانی بازرگانەکان تا شمەکەکانیان زۆر بەگران بفرۆشن بەهاوەڵان، بڕیارەکە خاڵێکی تریشی لەخۆگرتبوو: ئەویش ئەوەبوو کەکەس نابێت گویٚ لەبانگەوازی خوا بگرێت...

هەرلەبەرئەوە بوو کەلەماوەی سیٚ ساڵدا کەس لە قورەیش موسڵمان نەبوو.



گەمارۆکە گەیشتە ئاستێکی لەسنور دەرچوو بەجۆرێك نەوەی (هاشم) ناچاربوون گەڵای دارەکان بخۆن، مەرجی قورەیشیش بۆلابردنی گەمارۆکە تەنها ئەوەبوو کە پێغەمبەر(ﷺ) بدەن بەدەستەوە تابیکوژن، یان واز لەبانگەوازەکەی بهێنێت!!

پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەورۆژگارە دەکات و دەفەرموێت: ئەوەندە ئازار درام کەس ئازاری وا نەدرا، ئەوەندە برسی کرام کەس بەو شێوەیە برسی نەکرا، لەودۆڵ و شیوانەدا ٣٠رۆژ بەسەرما تێپەڕی نەمن ونە (بلال) ژەمێك تێر نەبووین ئەوە نەبێت کە(بلال) جارجارە لەژێر باڵیدا بۆی دەهێنام... ئەو گەمارۆیە تەنها لەوەرزی حەجدا لادەدرا لەبەرئەوەیقورەیش لەناوبانگی خۆی دەترسا لەنێو عەرەبدا ...

بارودۆخەکە ٣ساڵ بەوشێوەیە بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەر پابەندی حەق بوون و پاشگەزنەبوونەوە، کەس لەوان لەبیروباوەڕی خۆی هەڵنەگەڕایەوە، لەکاتێکدا کەسانی دەوڵەمەندیشیان تیابوو کەوەك هەژارەکان برسی کرابوو، چونکە خۆشەویستییان بۆ ئیسلام لەدەرونیاندا تەواو چەسپابوو ...

قورەیش،(خەدیجە)یان سەرپشك کرد بەوەی کەدەتوانێت لەبازنەی گەمارۆکە دەربچێت، بەڵام ئەو بەویستی خۆی گەمارۆی لەگەڵ هاوسەرەکەیو سەرجەم خوشك و براکانیدا هەڵبژاردو بڕیاریدا لەگەڵ ئەواندا بمێنێتەوە.

## هەموو بێباوەڕێک دوژمن نیە !

(هشام)ی کوڕی(عمرو )ی (عامری ) موسڵمان نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەوستەمە ڕازی نەبوو کە لەموسڵمانان دەکرا، بەتایبەت کەسانێك لەهۆزەکەی خۆی بە بەرچاویەوە برسی دەکران، بۆیە هەموو شەوێك گوێدرێژەکەی لەخواردن باردەکردو بەرەو ئاراستەی شیوەکە پاڵی پێوە دەناو پاشان بۆ بەیانی دەهات گوێدرێژەکەی دەبردەوە ..

بێگومان پاڵنەری بۆ ئەو کارە شەهامەت و خزمایەتی بوو، بۆیە ناکرێت هەمیشە بێباوەڕان بەچاوی دوژمنایەتیەوە سەیربکرێن، بەڵکو دەکرێت هەوڵ بدرێت، خاڵی هاوبەش و هاوکاریی ڕەچاوبکرێت و لایەنە مرۆییەکان حسابیان بۆ بکرێت.

کاتێك قوڕەیش زانیان (هشام) ئەو کارە دەکات لێیان پرسی شوێن ئاینی (محمد) کەوتووی؟! وتی: نەخێر، وتیان ئەی بۆ ئەم کارەت کرد؟ وتی: لەبەر خاتری خزمایەتی !! .

ئەوسا جارێکی تریش دوبارەی کردەوە، کاتێك قوڕەیش پێیان زانی زۆر بەتوندی لێیانداو پەیمانیان لێوەرگرت جارێکی تر کاری وانەکات، بەڵام ئەوهەر بەردەوام بوو، بۆیە زۆر بەتوندی لێیاندا، ئەوە بوو (أبو سفیان)، کەوتە نێوانیان هەرچەندە لەوساتەدا سەرسەختزین دوژمنی ئیسلام و موسڵمانان بوو،وە ڕێگەی نەدا لەوەزیاتر لێیبدەن، پاشان پێی وتن: واز لەو پیاوە بهێنن با لەسەر پەیوەندی خزمایەتی خۆی بەردەوام بێت و هەموو ڕەوشتەکانمان خراپ مەکەن.

دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر گەمارۆدا لەشیوی (أبو طالب).

موسڵمانان بووبوون بەسێ بەشەوە: بەشێك لەحەبەشەو بەشێك لەشیوی (أبو طالب)و بەشێکیش لەناو مەککەدا لەژێر ئەشکەنجەو ئازاردا دەیان ناڵاند بێگومان بەردەوام ئەو ئایەتانە دەهاتن کە هانی پێغەمبەر(ﷺ)وەئیمانداران دەدەن بۆ خۆگریو نواندنی هەڵوێستی جوان:﴿ وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ (يونس / ٩٩)

﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَى مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا وَلاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ وَلَقدْ جَاءكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ﴾ (الأنعام / ٣٤ )

﴿قَالُواْ أَإِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ قَالَ أَنَاْ يُوسُفُ وَهَـذَا أَخِي قَدْ مَنَّ اللّهُ عَلَيْنَا إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيِصْبِرْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (يوسف / ٩٠)

﴿حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّواْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَاءهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَاء وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾ (يوسف / ١١٠)

دوای سێ ساڵ ئارامگرتن و خۆگرتن لەبەردەم ناهەمواریەکاندا .... هیچ یەکێك لەباوەڕداران تۆزقاڵێك پاشەکشەیان نەکرد بەڵکو بەردەوام ئارامگریو خۆڕاگریو پشودرێژی پیشەیان بوو، بانگەوازێك بوو بۆ کەسانی تر. زۆرجار هەڵوێستی موسڵمانان هۆکارە بۆتێفکران و ڕامانی کەسانی تر، بێگومان دەرەنجامی دەبێتە هۆی کەمەندکردنی خەڵکانی ژیرو تێگەیشتنیان لەوەی کەدیارە ئەو خەڵکە خۆڕاگرو ئارامگرە خاوەنی بیروباوەڕێکی زۆر بەنرخن، بۆیە ئاوا ئامادەن لەپێناویدا ئەو هەموو ڕەنج و زەحمەتە قبوڵ بکەن!!

ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لەوەرزی حەجدا لەپاڵ کەعبەدا نوێژی دەکرد (عمرو)ی کوڕی(عبسە) بینینیو پێی وت: تۆ کێیت؟ فەرمووی من پێغەمبەرم و خوا ناردوومی، (عمرو) وتی: بۆچی ناردویتی؟ فەرمووی: بۆڕاگرتنی پەیوەندی

خزمایەتیو شکاندنی بتەکان. (عمرو) وتی: کێت لەگەڵدایە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئازادو بەندەیش، ئاماژەی بۆ (بلال)و(أبوبکر) کرد.

کاتێك(عمرو) دیمەنی(بلال)و(أبوبکر)ی بینی لەتەنیشت یەکترەوەن زۆر خۆشەویستی ئەم ئاینەی چووە دڵەوە کەجیاوازی لەنێوان شوێنکەوتوانیدا ناکات ... ئینجا (عمرو) بەپێغەمبەری وت: من ئەبمە شوێنکەوتەی تۆ (أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أنك رسول الله) .

(عمرو) دەڵێت: لەوکاتەوە پێغەمبەر(ﷺ)م نەبینیوەتەوە هەتا ئەمرۆ کە١٥ساڵ دەکات، دوای رزگارکردنی مەککە (عمرو) هاتە خزمەتیو سەیری پێغەمبەری کرد پێی وت: منت لەبیرە؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: تۆ(عمرو) کوڕی (عبسە)یت؟! (عمرو) دەستی کرد بەگریان دیارە لەسۆزو خۆشەویستی بۆ ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ)کەکەس لەیاد ناکات.

## کەس نازانێت سەربازانی خوا کێن!!

گەمارۆ هیچ ئاکامێکی نەبوو، بۆیە سێ کەس لەسەرانی قورەیش کەبریتی بوون لە:(مطعم)ی کوڕی(عدی)و (هشام)ی کوڕی(عمرو) و(أبو البختری)ی کوڕی (هشام) هاتنە دەرو وتیان: سوێند بەخوا نان ناخۆین نەوەی (هاشم) برسیان بێت، بۆیە بەرەو(کعبە)ڕۆیشتن کەبڕیارەکەی قورەیشی پێدا هەڵواسرابوو دەربارەی گەمارۆدانی نەوەی (هاشم)، خەڵکێکی زۆریش هاتبوون بۆ دڕاندنی ئەو بڕیارنامەیە. کاتێك(أبو سفیان) ئەمەی بینی وتی: ئەم نەخشەیە بەشەو دارێژراوە، بۆیە قورەیش ناچاربوو بڕیارەکە بدڕێنێت، کاتێ سەیریانکرد خوای گەورە مۆرانەی ناردووە هەموو نوسینەکەی لەناوبردوە جگە لەوشەی (بأسمك اللهم) ... کاتێك ویستیان بڕیارەکە بدڕێنن، (أبو طالب) هات



و پێی ووتن: برازاکەم هەواڵی پێداوم کەخوای گەورە مۆرانەی ناردووە بۆ ئەو بڕیارەی هەڵتان واسیوە هەمووی خواردووە جگە لە(باسمك اللهم)، ئەوسا چوونە ناوکەعبەوە، (أبو طالب) وتی: ئەگەر قسەی برازاکەم ڕاستە با ئەم دابڕانە کۆتایی پێبهێنین، کاتێك سەیریان کرد مۆرانە هەموو پەڕەکەی خواردووە تەنها (باسمك اللهم) نەبێت ...

خوای گەورە ڕاستی فەرمووە ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَاناً وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلاً كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ﴾(المدثر/ ٣١).

ئەوسا ئیتر ئەم گەمارۆ ستەمکارانەیە کۆتایی هات کەسێ ساڵی خایاندو موسڵمانان بەهۆی ئارامگرتن و خۆڕاگرییانەوە لەگەمارۆکە هاتنەدەر کافرانی قورەیش یش ڕیسوابوون و نائومێدیان بۆمایەوە..

## ساڵی ماتەمینی :

لەساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا (أبو طالب ) کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) دوای کۆچی دوایی مامی دەفەرموێت: هەرگیز ئەوەندە ئازار نەدرام وەك ئەوەی کەدوای کۆچی دوایی مامم ئازار درام ، هەندێ ڕیوایەت دەڵێت دوای ٣ یان ٧ ڕۆژ لە کۆچی (أبو طالب) ، خاتو (خدیجە)یش وەفاتی کرد ... لەساتەوەختی کۆچی (خدیجە)دا خواڵێی ڕازیبێت (جبریل) هات بەپێغەمبەری فەرموو(ﷺ) سڵاوی خوا بگەیەنە بە(خدیجە)وپێی بفەرموو: خوای گەورە مژدەی دەداتێ بەکۆشکێکی تایبەتی، کەدورە لەهەموو هات و هاوارو

ناخۆشیەك. ئەویش فەرمووی: خوای گەورە هەر خۆی سەلامەو سەلامیش هەر لەو زاتەوە فێربووین ...

دوای کۆچی دوایی خاتوو(خدیجە) بەماوەیەك ئافرەتێك لەهاوەڵان هاتە خزمەتی پێغەمبەرو وتی: یارسول الله ئەوە ژن ناهێنی؟! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆکەس هەیە جێگەی (خدیجە)م بۆ پڕبکاتەوە؟! ئەو باوەڕی پێهێنام لەکاتێکدا خەڵکی بڕوایان پێنەدەکردم، دڵنیابوو لەڕاستگۆییم لەکاتێکدا خەڵکی باوەڕیان وانەبوو، دڵنەوایی کردم لەکاتێکدا خەڵکی دژایەتیان دەکردم.

لەڕاستیدا پێغەمبەر(ﷺ) دوو ئامێزی لەدەستدا ئامێزێك لەماڵەکەیدا، ئامێزێکیش لەدەرەوە، دیارە لەدەستدانی هەردوو ئامێزەکە نەخشەیەکی خوای گەورەبوو تاپێغەمبەر(ﷺ) تەنها پشت بەو ببەستێ، چونکە هەموو شت لەدنیادا کۆتایی دێت و تەمەن کۆتاو فانیە : ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيراً﴾(الفرقان/٥٨) .

لەلایەکی تریشەوە دەبێت ئیماندار دڵنیابێت کەهەر خوای گەورە دەپارێزێت لەنەخشەی ناحەزان، هەروەها تاقیدەکاتەوە بەلەدەستدانی خۆشەویستانی، تادڵنیا بێت لەوەی کەهیچ بارودۆخێك تاسەرنیەو مردن یەخە بەهەموان دەگرێت ...﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾(الزمر/٣٠)

بەو شێوەیە پێغەمبەر(ﷺ)بووە سونبولێکی (توکل)و پشت بەستن و ڕازی بوون بەهەموو ئەوشتانەی کەویست وئیرادەی خوای گەورەی لەسەرە. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەسەر بانگەوازەکەی بەردەوام بوو، خوای گەورەش دڵخۆشی دەکردو ئایەتی بۆ دەنارد: ﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴾(الطور / ٤٨) .



**کۆچ بۆ طائف:**

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەستی‌کرد کەقورەیش نایەت بەدەم بانگەوازەکەیەوە، بیری لەشوێنێکی تر کردەوە، تا پەیامی خوای پێڕابگەیەنێت، بەو هیوایەی کەسێکی دەست بکەوێت کۆمەك و هاوکاریی بکات، بۆیە (طائف)ی هەڵبژارد، لەبەرئەوەی (طائف)بەرکابەری قورەیش ئەژمار دەکرا.

پێغەمبەر(ﷺ)بەپێ لەگەڵ (زید)ی‌کوڕی(حارثة)دا بەرەو(طائف) کەوتەرێ ...

بۆئەوە بەپێ‌کەوتنەرێ هەتا قورەیش هەست بەچوونە دەرەوەی نەکەن، چونکە ئەگەر قورەیش پێغەمبەر(ﷺ) ببینن بەپێ لەمەککە دەردەچێت وا گومان دەبەن بەرەو شوێنێکی نزیك دەڕوات ...

پێغەمبەر(ﷺ) دوای ٤ ڕۆژ گەیشتە (طائف) و ڕۆیشتە لای سەرانی هۆزەکان، ئەویش بەئامانجی داواکردنی پارێزگاری‌و پاراستنی خۆی‌و بانگەوازەکەی بەڵام سیان لەسەرانی (طائف) زۆر بەڕەقی وەڵامیاندایەوە یەکێکیان وتی: خوا کەسی لەتۆ باشتر دەست نەکەوت بینێرێت بۆ پێغەمبەرایەتی؟!

دووەمیان وتی: ئەگەر بەڕاستی تۆ پێغەمبەریت ئەوا زۆر لەوەگەورەتری کەکەسێکی وەکو من قسەت لەگەڵ بکات، خۆ ئەگەر درۆزنیشی ئەوا زۆر لەمە نزمتری قسەت لەگەڵدا بکەم !!

سێیەمیان وتی: ئەگەر بەپەردەکانی کەعبەوە خۆت هەڵواسیت و سوێند بخۆیت پێغەمبەریت، بڕوات پێ‌ناکەم!!



پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (( ئەگەر ناتانەوێت موسڵمان بن و نایشتانەوێ پارێزگاریم لێ بکەن باقورەیش بەم سەردانەم نەزانێت!!

کەچی وتیان: (والله) ئەم هەواڵە ئەگەیەنینەقورەیش، بۆیە فەرمانیاندا بەکەسێك کەپێش پێغەمبەر بکەوێ بۆمەککەو پێیان بڵێ (محمد) هاتۆتە لایان تا لە دژی قورەیش ئێمە کۆمەکی بکەین بەڵام ئێمە ئامادەنەبووین!!

هەروەها وتیان: (والله)نابێ بگەڕێتەوە هەتا بەردباران نەکرێت بۆئەوەی جارێکی تر نەیەیتەوە بۆئێرە، بۆیە منداڵ و هەرزەکانیان خستە دوایو بەردبارانیان کرد ... (زید )یش پارێزگاری لەپێغەمبەر(ﷺ) دەکرد بەلاشەیو سەری خوێنی پیاداهات و قاچی پێغەمبەر(ﷺ) بریندارببوو، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت هەتا گەیشتە بێستانێکی بچوك و چووەناوی، لەوێدا دانیشت و دەستە پیرۆزەکانی بەرزکردەوەو ئەم نزایەی بەکوڵ فەرموو: (خوایەگیان سکاڵای لاوازیو بێقەدریم لەنێو خەڵکیدا لەلای تۆ دەکەم تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی تۆ پەروەردگای چەوساوەو لاواز کراوانیت، پەروەردگاری منیشی تۆ دەمدەیتە دەست کێ؟ دەست کەسانێکی دور کەبەڕووی گرژەوە پێشوازیم لێبکەن و پیاماهەڵشاخێن؟! یان دەمدەیتە دەست کەسانێکی نزیکم کەکاروبای منیان بەدەستە!! بە لام هەرتۆ لێم زیز نەبیت قەیناکە ...

من پەنادەگرم بەنووری ڕوخسارت کەتاریکستانەکانی ڕوناك کردۆتەوە وەکاری دنیاو قیامەتی پێئاسان بووە، کەرق وخەشمی تۆ داباریتە سەرم، یاخود لێم زیز وزویر ببیت، هەمووستایشێك شایستەی تۆیە هە تارازی دەبیت، هیچ پشت و پەنایەکیش نیە پشت و پەنای تۆ نەبێت).

لەوحاڵەتەدابوو لاوێك هاتە خزمەتی ناوی(عداس)بوو خزمەتکاری (عتبە)و(شیبە)ی کوڕانی (ربیعە) بوو، هەردووکیان لەبێباوەڕان بوون بەڵام



کەپێغەمبەریان بینی لەوحاڵەدا بوو بەزەییان پێدا هاتەوە، بۆیە (عداس)یان بەچەند هێشووە ترێیەکەوە ناردە لای، (عداس)یش ترێکەی بردوو لەبەردەم پێغەمبەر(ﷺ)دادینا، پێغەمبەر((ﷺ)دوای ئەوەی بەدەنگی بەرز ناوی خوای هێنا کەوتە خواردنی، (عداس) وتی: ئەم وشەیە خەڵکی ئەم ناوە نایڵێن. پێغەمبەر(ﷺ) سەیرێکی (عداس)ی کردو فەرمووی: ناوت چییە؟ وتی: ناوم (عداس)ە، پرسی خەڵکی چ وڵاتێکی؟ (عداس) وتی: نەینەوا. پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی خەڵکی شاری پیاوە صاڵحەکەی (یونس)ی کوڕی(متی)؟ (عداس) وتی: بۆ تۆ(یونس)ی کوڕی(متی) دەناسیت؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: بەڵێ ئەو برایەم پێغەمبەر بوو منیش پێغەمبەرم ... ئەوسا (عداس) خۆیدا بەسەر هەردوو قاچی پێغەمبەردا(ﷺ) بەگەرمی ماچی دەکردن!!

جا وردبەرەوە لەو قاچە پیرۆزانەی کەکوتران و بریندارکران ئێستا چۆن ڕێزی لێ دەگیرێت و ماچ دەکرێت، پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەو ڕۆژەمان بۆ دەکات، کاتێ خاتوو(عائشە)ی دایکی بڕواداران پرسیاری لێکرد: ئەی پێغەمبەری خوا قورسترین ڕۆژێك بەسەردا تێپەڕیبێ کام ڕۆژە بوو فەرمووی: دوای گەڕانەوەم لەطائف لەکاتێکدا بە(قم الثعالب)دا دەڕۆیشتم، (جبریل) هات و فریشتەی کێوەکانی لەگەڵ بوو، (جبریل) وتی: بێگومان خوای گەورە ئاگاداری گوفتاری تۆیش و ئەوانیش بوو، ئەوەتە فریشتەی کێوەکانی ناردووە، تا فەرمانت بەچییە، ئەنجامی بدات!! ئەوسا فریشتەکە وتی: ئەگەر دەتەوێت زنجیرە چیاکانیان بەسەردا دەڕوخێنم ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر، ئومێدەوارم کەلەنەوەی ئەوانە کەسانێکی خوا پەرست پەیدابێت.

دیارە خوای گەورە ڕاستی فەرمووە ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (التوبة / ١٢٨)

واتە:ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانەکراوە کەهەریەکێکە لەخۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە گەر تووشی بەڵاو ناخۆشی ببن، زۆر بەتەنگیشتانەوەیە پەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانەو میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان.

پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بەرەو مەککە، (زید) لێی پرسی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بگەڕێینەوە ناو مەککە لەکاتێکدا ئەوان زانیویانە ئێمە لە(طائف) بووین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی (زید) دەبینی خوای گەورە دەروی خێرمان لێدەکاتەوە، خوای گەورە ئایینەکەی خۆی سەر دەخات و سەری پێغەمبەر بەرزدەکاتەوە، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە(زید) بڕوات بۆ لای یەکێك لەهۆزەکان و داوای پارێزگاریان لێبکات، بەڵام هۆزی یەکەم ودووەم و سێیەم ڕازینەبوون پەنایان بدەن پاشان چووە لای(مطعم)ی کوڕی(عدی).. ئەوکەسەی بڕنامەی گەمارۆکەی دڕاند ئەویش پەنایدان و بەرگی جەنگی کردەبەری کوڕەکانی هەتا پێغەمبەر((ﷺ) بپارێزن کە هاتە ناوشارەوە... (أبو جهل )چوو بۆلای ( مطعم)و وتی: شوێن ئایینەکەی کەوتویت یان هەر پەنادەری؟ وتی: تەنها پەنادەرم ، (أبو جهل) وتی: کەواتە قبوڵمانە!!

پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە ناو مەککەو پێش ئەوەی بچێتەماڵەکەوە ڕۆیشتە (کعبە)و بەدەوریدا(طواف)ی کرد، ئەمەش وەك وروژاندنیان نەبوو بەڵکو وەك سوربونێك بوو لەسەر بیروباوەڕو بانگەوازکردن بۆ خوا ..

**شەوڕەویو بەرزبونەوە :**

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە(طائف) بەغەمباریو دڵشکاوی، ئەوەبوو لەنزاکەیدا فەرموو بووی: خوایە هەر تۆلێم زویر نەبیت، من باکم نیە ... خوای گەورەش نزاکەی گیراکردو بڕیاریدا سەفەرێکی ڕێزلێنانی بۆ سازبکات، کەلەوەو پێش و لەوەودواش هیچ مرۆڤێك شتی وای بەخۆیەوە نەدیوە... ئەویش (معجزە)ی شەوڕەویو بەرزبونەوەبوو، لەشەوی ٢٧ی (رجب)ی ساڵی١٠ی پێغەمبەرایەتیدا ئەم سەفەرە پیرۆزە ڕویدا کە بەساڵی ماتەمینی ناوزەدکراوە، چونکە لەو ساڵەدا (أبوطالب) و خاتوو (خديجه) بەشوێن یەکدا کۆچیان کرد.

دیارە یەکێك لەمەبەستە پیرۆزەکانی ئەوسەفەرە بەفەڕە ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) بەتەواوی دڵنیا بێت کە: ئەو لەلای پەروەردگاری زۆر ڕێزدارە .

پێغەمبەر(ﷺ) سەفەرەکەی بە(طواف)ی (کعبە) دەست پێکرد پاشان بەرەو مزگەوتی (أقصى) شەوڕەوی پێکرا، لەوێشەوە بەرەو ئاسمان بەرزکرایەوە ... ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ ﴾(الأسراء/١)

لەمزگەوتی (حرام)ەوە بە بوراق شەوڕەوی کرد بەرەو مزگەوتی(أقصى)، بوراق گیاندارێکی سپی لەگوێدرێژ بەرزترەو لەهێستر بچوکترە، سمی لەکۆتایی دەستیدا دادەنا، بوراق لەبەرقەوە هاتووە ئاماژەیە بەوەی کەبەخێرایی تیشك و زیاتریش فڕیوە!!

جالەوێ هەموو پێغەمبەران(علیهم السلام) هەر لە(أدم) ەوە هەتا (عیسی) سڵاوی خوایان لێ بێت ئامادەبوون و پێش نوێژی بۆهەموویان کرد.پاشان (جبریل) شەراب و شیری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنا، ئەویش شیرەکەی هەڵبژارد، (جبریل) زۆر بەو هەڵبژاردنە دڵخۆش بوو فەرمووی: بەئیسلام ڕێنمونی کراویت دیارە لەگەڵ تۆدا ئوممەتەکەشت بۆ ئیسلام ڕێنمویی کرا ...

جا لەسەرەتای سورەتی (إسراء)دا دوای باسکردنی شەورەوی باس لەنەوەکانی مرۆڤایەتی دەکات﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْداً شَكُوراً﴾(الإسراء/٣) ئەمەش ئاماژەیە بۆ بەیەك گەیشتنی مرۆڤایەتی.

لەشەورەویدا پێغەمبەر(ﷺ) بەلای کێوی(طور)دا تێپەڕی کەخوای گەورە لەوێدا فەرمایشتی لەگەڵ (موسی) ئەنجامدا، بەلای شاری(بیت لحم)دا تێپەڕی کە (عیسی)ی تێدا لەدایك بوو، پاشان بەرەو ئاسمان بەرزکرایەوە لەئاسمانی یەکەمدا چاوی بە ئادەم کەوت لە ئاسمانی دووەمدا بە (عیسی)و(یحیی).

لەئاسمانی سێیەمدا چاوی بە(یوسف)و لەئاسمانی چوارەمدا بەدیداری(أدریس) شاد بوو، لەئاسمانی پێنجەمدا چاوی بە(هارون )کەوت، لەئاسمانی شەشەمدا بەدیداری (موسی ) شاد بوو، لەئاسمانی حەوتەمدا بەدیداری باوکی پێغەمبەران(إبراهیم) سڵاوی خوا لە هەموویان بێت شادو خۆشنود بوو .

## تۆ لەکام تاقم و گرۆیانیت!

کاتێك (جبریل)و پێغەمبەر(ﷺ)بەرەو ئاسمان سەرکەوتن (جبریل) لەدەروازەکانی ئاسمانی دەدا، فریشتەی دەروازەکان دەیپرسی کێیە؟!(جبریل سڵاوی خوای لێبێت دەیوت: (جبریل)م فریشتەکە پرسی ئەی ئەوەکێیە لەگەڵتا؟ دەیوت: (محمد)ی کوڕی(عبدالله) یە...



پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: کاتێك چوومە ئاسمانی یەکەمەوە پیاوێکم بینی، وتم: ئەمە کێیە؟ (جبریل) فەرمووی: ئەوە ئادەمی باوکتە، ئەوسا بینیم ئادەم سەیری لای ڕاستی دەکرد قەرەباڵغی‌یەکی زۆری دەبینی، لەخۆشیدا پێدەکەنی، پاشان سەیری لای چەپیشی دەکرد ڕەشایەکی بێ شوماری دەبینی دەگریا.. پرسیم لە(جبریل) بۆچی وادەکات؟! وتی: کاتێك نەوەکانی دەبینێت کە لەبەهەشتدان لە خۆشیدا پێ دەکەنێت .کاتێکیش سەیری نەوەکانی دەکات لەدۆزەخدا دەگری بۆیان .

کەواتە ئەی براو خوشکی خوێنەر ئێستا تا فرسەتە لە خۆت بپرسە تۆ لەکام لەو دوودەستەیەیت ؟!

**نامەی إبراهیمی باوکتان :**

لەئاسماندا پێغەمبەر(ﷺ) چاوی بە(إبراهیم) پێغەمبەر کەوت، بەپێغەمبەری فەرموو: ئەی (محمد): سلاوم بگەیەنە بە ئومەتەکەت پێیان بڵێ ، بەهەشت جێی پاکانە، جێی چاندنی (سبحان الله و الحمدلله و ولاإله إلا الله و والله أکبر) ە ....

**(ماشطە)ی کچی فیرعەون:**

پێغەمبەرﷺ لە ئاسماندا، بۆنێکی زۆر خۆشی هەست پێ کرد بە (جبریل) ی فەرموو ئەم بۆنە خۆشە چی یە ؟ فەرمووی ئەوە بۆنی (ماشطة)ی کچی فیرعەون و چوار منداڵەکەیەتی!! کەدیندارو خواناسبوو.

**حاڵی داوێن پیسان و ماڵی هەتیو خۆران لە ئاگردا :**

پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکێکی زۆری بینی لە پیاوان و ژنانی (شەرواڵ پیس و داوێن پیس) گۆشتێکی پاك و گۆشتێکی بۆگەنیان لەبەردەمدا بوو، کەچی گۆشتە پاکەکەیان نەدەخواردو پەلاماری گۆشتە بۆگەنەکەیان دەدا.



هەروەها خەڵکانێکی بینی دەمیان کرابوەوەو تۆپی ئاگرینیان فڕێ دەدایە ناوی، پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە(جبریل) کرد سڵاوی خوای لێبێت ئەمانەکێن؟ فەرمووی: ئەمانە ئەو کەسانەن کە بەستەم ماڵی هەتیوان بەناحەق دەخۆن:﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً﴾ (النساء/ ١٠).

## حاڵی ئەو کەسانەی کە باسی ناموسی خەڵکی دەکەن:

پێغەمبەر(ﷺ)خەڵکانێکی بینی نینۆکی مسیان هەبوو دەم و چاوو سنگی خۆیان پێدەڕنییەوە، بە(جبریل)ی فەرموی: ئەمانەکێن، ئەویش فەرمووی: ئەمانە ئەو کەسانەن کەغەیبەتی خەڵکی دەکەن و باسی ناموسیان دەکەن.

## لەلای ( سدرة المنتهى ) :

پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە شوێنێك (جبریل) نەیدەتوانی بچێتە پێشەوە، ئەویش (سدرة المنتهى) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت سەیری (جبریل)م کرد لەترسی خوا وەك جلە کۆنی لێهاتبوو ...

﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى* عِندَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى* عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى* إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى* مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى* لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾(النجم / ١٣-١٨)

واتە: سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تریش لە دابەزینێکی تردا جوبرەئیلی بینیوە* لەکاتێکدا لە (سدره المنتهى)دابوو* کەلەوێدا بەهەشتی (مأوى) هەیە بەواتای لانەو جێگەی حەوانەوە* کاتێك ئەوەی-سدرة-ی داپۆشی مەگەر هەرخوا خۆی بزانێت کێن و چین و کاریان چیە* بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) لەو



شەوەدا لەبەڵگەو نیشانەو موعجیزە گەورەکانی پەروەردگاری بینیوە، بەچاوی سەری، بەهەموو هەستی.

ڕاو بۆچوون دەربارەی بینینی خوای گەورە لەلایەن پێغەمبەرەوە جیاوازە، بێگومان ئیمانداران لەقیامەتدا خوای پەروەردگاریان دەبینن ...

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ* إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾(القيامة / ٢٢-٢٣)

واتە: بەمەرجێك ئەو ڕۆژە، ڕوخسارانێك گەشاوەو ناسك و ئاسودەن* چونکە تەماشای پەروەردگاریان دەکەن.

### ❁ نوێژ:

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)گەیشتە (سدرة المنتهى) خوای گەورە پێی ڕاگەیاند ٥٠ نوێژی لەسەر ئوممەتەکەی فەرزکردووە .

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) دابەزیو بەموسا (سلاوی خوای لیبێت) گەیشت، پرسی: چی لەسەر ئوممەتەکەت فەرزکرا؟ فەرمووی: ٥٠ نوێژ، موسا فەرمووی: ئوممەتی تۆ بەرگەی ئەوە ناگرێ، بگەڕێرەوە لای خواو داوای کەم کردنەوەی لێبکە، پێغەمبەریش(ﷺ) گەڕایەوە (سدرة المنتهى )وداوای لەخوای گەورە کرد کەمیبکاتەوە، خوای گەورە کردی بەنیوەی،پاشان پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە خوارەوەو لەڕیگادا موسای پێگەیشتەوەو داوای لێکرد بگەڕێتەوەو داوای کەمکردنی زیاتری لێ بکات، خوای گەورەش کەمی کردەوە بۆ ١٥ نوێژ، پاشان موسا پیێی فەرموو: داوابکە خوای گەورە سوکتری بکات لەسەر ئوممەتەکەت، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوەو بۆی کرا بەپێنج نوێژ بەلام پاداشتی٥٠ نوێژەکەی هەیە پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە لای موسا، دووبارە فەرمووی:

بگەڕێرەوە داوای کەمتری لێ بکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: شەرمم لە خوای پەروەردگار کرد لەوە زیاتر داوای کەم کردنەوەی لێ بکەم .

کەواتە نوێژ تاکە فەرزێکە لەفەرزەکانی ئیسلام کە لە ئاسماندا فەرزکرابێ، بۆیە دەستم دامێنتان نەکەن لەیادی بکەن یان بەکەم سەیری بکەن و بەسوك تەماشای بکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد کێ لەئێوە چۆتە بەهەشتەوە؟(عبداللە)ی کوڕی(عمر) فەرمووی: من ... (عمر)ی کوڕی(خطاب) دەستی خستە سەر دەمی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی کێ لەئێوە لەڕووبارەکانی، ئاوی خواردۆتەوە؟ (عبداللە)ی کوڕی(عمر) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ... (عمر)ی کوڕی(خطاب) دەفەرموێت: دەستمدا بەسەرما، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی کێ لەبەروبومەکەی خواردووە؟

هەر (عبداللە)ی کوڕی(عمر) فەرمووی: من ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئادەی (عبداللە) پێیان بلێ ...

(عبداللە)یش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەچوونی بەڕێزتان لەشەوی بەرزبوونەوەتدا بۆبەهەشت منیش وادەزانم چوومەتە ناوی، لەئاوی ڕووبارەکانیم خواردەوە، بەخواردنەوەی بەڕێزتان، هەروەها لەبەروبومەکانیم خوارد بەخواردنی بەڕێزتان ...

## موسڵمان بوونی ( أنصار ) :

لەمیانەی وەرزی حەجدا لەساڵی (١٠)ی پێغەمبەریەتیدا خەمی یەکەمی پێغەمبەر دۆزینەوەی هۆزێك بوو لەدەرەوەی مەککە بۆئەوەی بیپارێزن هەتا بتوانێت پەیامی خوا بەبێ ترس و بیم بگەیەنێت، لەماوەی ١٠رۆژدا چاوی بە وەفدی٢٦ هۆز کەوت گفتوگۆی لەگەڵ کردن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سووربونی پێغەمبەر(ﷺ)، وەنائومێد نەبوونی، بێگومان زۆریی ئەو هەوڵانە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەم مانایە ... لەگەڵ هەر هۆزێکدا قسەی دەکرد، بەناشرینی وەڵامیان دەدایەوە، (بنی حنیفە) زۆر بە توندی رەتیان کردەوە، (بنی کلب)و هۆزی (بنی صعصە) کەسەرۆکەکەیان ناوی (بحیرە)ی کوڕی(فراس) بوو، ئەمیش بەهۆزەکەی ووت: ئەگەر پشتی ئەم پیاوە بگرن ئەوا هەموو (عرب) دەکەوێتە ژێر دەستتان، چونکە بەزیرەکی خۆی زانی کەپێغەمبەر(ﷺ)لە بانگەوازەکەیدا سەردەکەوێت، بۆیە رۆیشتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و پێی وت: ئەگەر پەیمانت پێبدەین و بتپارێزین هەتا خوای گەورە سەرت دەخات، ئایا دوای تۆ ئەبینە خاوەنی شتێك!

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بەدەست خوایەو بەویستی خۆی بڕیاری لەسەر دەدات.

(بحیرە) وتی: باشە، ئێمە خۆمان بخەینە مەترسیەوەو هەموو عەرەب بکەینە دوژمنی خۆمان، کەسەرکەوتنت بەدەست هێنا دەستبەردارمان ببیت!! سوێند بەخوا کاری واناکەین ...

پاشان پێغەمبەر((ﷺ)رۆیشت بۆلای (بنی عامر) وباسی ئیسلامی بۆ کردن و داوای پشتیوانی لێکردن، ئەوانیش رازی بوون و پێشوازییان لێ کرد،



لەوکاتەدا گەورەکەیان هات ناوی (أجرة)ی کوڕی(قیس) بوو وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەمە دەڵێت من پێغەمبەری خوام و دەیەوێت پشتی بگرین و پارێزگاری لێبکەین هەتا پەیامی خوا بگەیەنێت ئێمەش وتمان: ئامادەین.(أجرة) وتی: (والله) کەسم نەدیوە وەکو ئێوە چارەنوسی خۆی بخاتە مەترسیەوە!! پاشان ڕووی کردە پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: هەستە کابرا خۆت بگەیەنە هۆزەکەت، (والله) ئەگەر لەناو ڕەشماڵەکانماندا نەبویتایە لەگەردنم دەدایت!! پێغەمبەریش بەدڵێکی خەمبارەوە هەڵساو سواری ووشترەکەی بوو، (أجره) بەگۆچانەکەی دای لەوشترەکە، وشترەکە هەڵسڵەمیەوەو پێغەمبەری خوای(ﷺ) خستە خوارەوە، (أجرة) بەم دیمەنە زۆر پێکەنی...

لەوکاتەدا کەپێدەکەنی ئافرەتێکی (بنی عامر) کەنیشتەجێی مەککەبوو موسڵمان بوو چاوی لەو دیمەنە بوو هاواری کرد: ئەی (بنی عامر) یاخوا تەمەن درێژ نەبن، ئەوەڕاستە ، لەنێوانماندا بەو شێوەیە ئاوا بە پێغەمبەری خوا دەکرێت ، بەم قسەیەی ئافرەتەکە سێ کەس لە گەنجانی (بنی عامر) پاڵیان نا بە(أجرة)وەو بەرگرییان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ)بەمەش شەڕ لەنێوان ئەو سێ گەنجەو(أجرة)و دووکەسی تر کە بەرگریان لە(أجرة) کرد دروست بوو... پێغەمبەر(ﷺ) نزای کردوو فەرمووی: خوایە بەرەکەت برێژە بەسەر ئەو سێ لاوەداو تۆڵە لە (أجره)و ئەو دووانە بکەرەوە (ئیتر ئەوەبوو ئەوسیانەی یەکەم موسڵمان بوون و پاشانیش شەهید بوون، (أجرة)یش زۆر بەخراپی مردو لاشەی بۆگەنی کردو خستیانە چاڵێکەوە لەگەڵ ئەو دوانەی کە بەرگریان لێ کرد..

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەو هەموو هەڵوێستە ناشایستانەدا هەر نائومێد نەبوو بەڵکو بەردەوام بوو لەسەر هەوڵەکانی هەرچەندە زۆر بەناشرینی وەڵامیان دەدایەوە، (أبو لهب)یش هەر بەدوایەوە بوو ئەچووە لای هەر تیرەو هۆزێك تا



بانگیان بکات پێی دەوتن: بڕوای پێ مەکەن من مامی ئەوم و خۆم دەیناسم، ئەو شێتە، ئەوانیش بڕوایان بەو دەکردو گوێیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نەدەگرت .

پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای هۆزی (بنی شیبان)و لەگەڵ سێ لەسەرانی ئەو هۆزەدا دانیشت ئەوانیش: (مغروق)ی کوڕی(عامر)و (هانيء)ی کوڕی(قريس)و (مثنى)ی کوڕی(حارة) بوون، پێغەمبەر(ﷺ) (أبو بكر)یشی لەگەڵدا بوو کەزۆر شارەزای نەژادو ڕەچەڵەکی عەرەب بوو، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ئەم هۆزە باوەڕبهێنن ئەوا خوا بەهۆیانەوە سەرفرازمان دەکات.... دوای ئەوەی چوونە ژوورەوە بۆ لایان (أبوبكر) لێی پرسین: ژمارەتان چەندە؟ مەبەستی لەجەنگاوەرەکانیان بوو... وتیان: زیاتر لەهەزار جەنگاوەر دەبین، وتی: بەرگرییان چۆنە! وتیان هەوڵدان و سووربوون لەسەر ئێمەو سەرکەوتن و برانەوەیش بەدەست خوایە، (أبوبكر) پرسی: جەنگی نێوان خۆتان و دوژمن چۆنە!! وتیان: ئێمە لەکاتی گەیشتن و تێکڕژان لەگەڵ دوژمنەکەماندا زۆر توڕەو بەجەرگین ئەسپەکانمان لەمنداڵەکانمان بەنرختره، چەکمان لەبوك لاخۆشەویستره، پاشان گەورەکەیان سەیرێکی پێغەمبەری کردو وتی: لەوەدەچێ تۆ خزمە قوڕەیشی یەکە بیت، (أبوبكر) وەڵامی دایەوە، بەڵێ، ئایا هەواڵت زانیوە کە پێغەمبەری خوایە؟! (مغروق) وتی: بەڵێ بیستومانە کە پێغەمبەری خوایە! ئێستا چیت دەوێت؟!

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پەنام بدەن و بمپارێزن هەتا پەیامی خوا بگەیەنم، قوڕەیش پشتیان کردوەتە فرمانی خواو دژایەتی دەکەن، خوایش زۆر دەوڵەمەندو بێ نیازە.



(مغروق) وتی: ئەی خزمی قورەیش: خەڵکی بۆچی بانگ دەکەیت، پێغەمبەر (ﷺ) چەند ئایەتێکی بۆ خوێندەوە ...

(مغروق) بێدەنگ بوو (هانيء) وتی: ئەی برای قورەیشی گوێم لەوتەکەت بوو ئەگەر بەیەك دانیشتن واز لەئاینەکەی خۆمان بهێنین کە نەسەرەتای هەیەو نەکۆتایی، ئەوە ڕایەکی دور لەژیرییە، ڕیسوایی لەپەلەکردندایە، بەڵام سەیر دەکەین و سەیربکە بیردەکەینەوەو بیربکەرەوە پاشان دەگەڕێینەوە بۆلات...

پاشان (مثنى)ی کوڕی(حارثة) هاتە نێو قسەکان و وتی: ئەی برای قورەیشی، من پێم وایە ئەوەی تۆ بانگەوازی بۆ دەکەیت پادشاکان قبوڵیان نیە، وەمن وادەزانم ئەگەر فارسەکان بەم باسە بزانن ئەوا لەدژمان بەجەنگ دێن.

پێغەمبەر(ﷺ) وەستاو فەرمووی: وەڵامەکەتان خراپ نەبوو مادام ڕاشکاوانە ڕاستیتان ووت.

دیارە ئەم کارە کەسێك نایکات تا تەواو بە ئاگانەبێ لێی.

پێغەمبەر(ﷺ) هەڵساو ڕۆیشت. پاشان دوای کەمێك گەڕایەوە فەرمووی: (( ئەگەر بینیتان خوای گەورە سەرکەوتنی پێبەخشیم و خاکی فارسی خستە ژێر دەستم خوای تاك وتەنها بەپیرۆزو پاکی دەناسن))؟ هەموویان بەیەك دەنگ وتیان: خوایە گیان بەشایەت بە بەڵێ... پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت و ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً* وَدَاعِياً إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجاً مُّنِيراً ﴾(الاحزاب/ ٤٥-٤٦ )

**( مثنى ای کوڕی (حارثة) جەنگ دژی فارس بەرپا دەکات!**

پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) أبوبکر بووە جێنشینی یەکەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ڕۆژێك هەواڵی پێگەیشت کە هۆزی (بنی شیبان) موسڵمان بوون و دەجەنگن دژی فارسەکان و کەسێکیش بەناوی (مثنى)ی کوڕی(حارثة)ی شەیبانی سەرکردایەتی ئەو جەنگە دەکات...

(أبوبکر) ناردی بەشوێنیدا، (مثنى) هات ولەبەردەم (أبوبکر)دا وەستا، پاشان کەخۆی پێناساند (أبوبکر) وتی: ئەگە ر پێغەمبەر(ﷺ) بمایەو ئاوا تۆی ببینیایە زۆر شادمان دەبوو.

(مثنى) وتی: چاوپێکەوتنەکەی پێغەمبەرت(ﷺ) دێتەوە یاد کەلەگەڵ هۆزی (بنی شیبان)دا ئەنجامیدا لەڕاستیدا ئەو کاتە من دەترسام بەڵام دوای ئەوەی موسڵمان بووم ترسەکەم نەما ئینجا أبوبکر فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ئێستە تۆی بدیایە زۆر خۆشحاڵ دەبوو... (مثنى ) بەو قسەیە زۆر گریاو وتی: ئەی (أبو بکر) هاوەڵێتی پێغەمبەرم(ﷺ) لەکیس چوو، نازانم چۆن لەڕۆژی قیامەتدا ڕوم بێت لەخزمەتیدا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾(الحديد/ ١٠)

واتە:جا ئیتر ئەوە چیتانە بۆچی ماڵ وسامانتان نابەخشن لەڕێگەی خوادا، خۆهەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆخوا دەمێنێتەوە، بێگومان چونیەك نین ئەوانەتان کەپێش ڕزگاریی مەککە؛ یاخود پێش سەرکەوتن، ماڵ وسامانی بەخشیوەو جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلەوپایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کەدوای

رزگاریی مەککەو بەدەست هێنانی سەرکەوتن ماڵ وسامانیان بەخشیوەو جەنگاون، بەهەردوولاشیان خوا بەڵێنی بەهەشتی بەخشیووە، بێگومان ئەو خوایە ئاگایە بەکاروکردەوەتان.

پاشان ئەوەندەی تر گریا.

دوای هۆزی (بنیشیبان) پێغەمبەر(ﷺ) چاوی بەیەکێك کەوت لە(بنی محارب) ناوی(رکانة)بوو ئەم پیاوە زۆرانباز بوو، پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئیسلامی بۆکردو، داوای لێ کرد کەپێکەوە قسە بۆ هۆزەکەی بکەن. کەچی (رکانە) وتی: بازۆران بگرین، بزانم دەرەقەتم دێیت، ئەوسا موسڵمان دەبم، پێغەمبەر(ﷺ) ناچار زۆرانبازی لەگەڵ کردو دای بەزەویدا کەچی وتی: ئەوە کوتوپڕ بوو، دوبارەو وسێبارە دایبەزەویدا، بەڵام کابرا درۆی کردو موسڵمان نەبوو!!

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) چاوی بەپیاوێك کەوت ناوی (سوید)ی کوڕی(صامت) بوو پیاوێکی دانا بوو حەزی لەکۆکردنەوەی پەندو ئامۆژگاری دەکرد.. پێغەمبەر (ﷺ) ئیسلامی بۆ باس کرد ...(سوید) وتی : شتێکم پێیە لەوەی تۆ هێناوتە چاکترە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چیت پێیە؟! (سوید) وتی: دانایی (لقمان)م پێیە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئادەی بڵێ... ئیتر کەوتە خوێندنەوەی هەندێ پەندوئامۆژگاری پێغەمبەر(ﷺ) چاك گوێی بۆ گرتبوو زەردەخەنەش لەسەر لێوانی بوو، کاتێك لێبوەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی تۆ گوێ لەمن دەگریت؟ (سوید)وتی: بەڵێ، ئەوسا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بەخوێندنەوەی چەند ئایەتێك لەقورئان دوای تەواو بوونی، (سوید) وتی: (واللە) ئەوەی تۆ زۆر لەوەی من باشترە، أشهد أن لاإله إلا الله وأنك رسول الله، پاشان بەپێغەمبەری وت(ﷺ): بەڵام من پیاوێکی لاوازم وناتوانم کۆمەکیت



بکەم، پێغەمبەریش(ﷺ) موسڵمان بونەکەی وەرگرت دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) چاوی بە(ضمار الأسدي) کەوت کەخەڵکی یەمەن بوو وچارەسەری شێتی دەکرد، (ضمار) وتی: پێم بڵێ: برازای خۆم لەچی نیگەرانی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بۆچی چیان پێ‌وتویت؟ (ضمار) وتی: پێیان وتوم کەتۆ جنۆکە دەستی لێوەشاندویت، منیش چارەسەری ئەو جۆرە نەخۆشیانە دەکەم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کەواتە گوێم لێ بگرە: سوپاس و ستایش بۆ خوایە، ستایشی دەکەین، پەنای پێ‌دەگرین لەخراپەی دەرونی خۆمان وکردەوە خراپەکانمان، ئەوەی خوای گەورە ڕێنمویی بکات، ئەوا هەرگیز گومڕا نابێت، ئەوەیشی گومڕا بێت ئەوە پاڵپشت و ڕێنمونیکاری نابێت... (ضمار) وتی: حەزدەکەم بۆم دوبارە بکەیتەوە! پێغەمبەریش(ﷺ) بۆی دوبارە کردەوە. (ضمار) وتی: تۆ کێیت؟ فەرمووی من پێغەمبەری خوام، وتی: ئەی بەچی فەرمان دەکەیت؟ فەرمووی: بەپەرستنی خوا، (ضمار) وتی: ئەی چی داوا دەکەیت؟ باوەڕبوون بەخوای تەنهاو وتنی (لاإله إلا الله) بڕواش بەوەی کەمن پێغەمبەری خوام.(ضمار) وتی: (أشهد أن لاإله إلا الله وانك رسول الله)، (ضمار ) موسڵمان بوو، بەڵام ئەم پیاوەش لاواز بوو نەیدەتوانی پشتگیری پێغەمبەری خوا بکات(ﷺ).

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) چاوی بە(طفیل)ی کوڕی(عمروالدوسی) یەمەنی کەوت.

(طفیل) هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) شاعیرێکی ژیر بوو پێش ئەوەی بگات بەپێغەمبەر(ﷺ) هەندێ لە قوڕەیش بینیان وپێیان وت: تۆ شاعیرێکی زیرەکی، ئێمەش جادوگەرێکمان هەیە دوبەرەکی دەخاتە نێوان ژن و مێردەوەو دوبەرەکی

دەنێتەوە،(طفیل) وتی: باشە چی دەڵێت؟! وتیان نەکەی گوێی بۆ بگریت!! پرسی: کامەیە؟ وتیان: ئەوەتە لای (کعبە)دایە ... (طفیل) ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر ولۆکەی خستبوە گوێچکەیەوە هەتا گوێی لەگوفتاری نەبێت..، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)(طفیل)ی بینی لەنوێژەکەیدا دەنگی بەرزکردەوە لەقورئان خوێندنەکەیدا، (طفیل) دەڵێت: خوای گەورە ویستی وابوو دەبێت گوێم لەهەندێك لەو ئایەتانە بێت کەبەدەنگی بەرز دەیخوێندەوە، (طفیل) لەدڵی خۆیدا وتی: ئەوەچی‌یە وادەترسیت، خۆتۆ شاعیریت، چۆن قسە جادوت لیّ دەکات؟! ئیتر لۆکەکەی لە گوێچکەیدا دەرهێناو لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزیك بوەوە، جوان گوێی بۆ قورئان گرت... کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لیّ بوەوە، (طفیل) دوای کەوت تا پێغەمبەر خۆی کرد بەماڵی خۆیداو بەدوایدا چووە ژوورەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) بەخێر هاتنی کردو باس ئیسلامی بۆ کرد، (طفیل) موسڵمان بوو ئینجا وتی: یارسول الله بەچی فەرمانم پیّدەکەیت؟! دیارە (طفیل) هەرلەوسەرەتایەوە هەست دەکات کە ئەرکێکی پیرۆز کەوتۆتە سەر شانی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموێت: بگەڕێرەوە ناو هۆزەکەت و بانگیان بکە بۆ ئیسلام، هەرکاتێك خوای گەورە سەرکەوتنی پێبەخشیم هەموویانم بۆ بهێنە، (طفیل) بەپێغەمبەری(ﷺ) وت: نزام بۆ بکە تا بروام پیّبکەن، پێغەمبەر(ﷺ) نزای بۆکردو فەرمووی: خوایە بەڵگەو نیشانەیەکی پیّبەخشە.. ئەوسا یەکسەر ڕوناکیەك لەنێوچاوانیدا پەیدا بوو، (طفیل) وتی: با لەنێو چاوانما نەبێت خوای گەورە کردیە گۆچانەکەیەوە.

دوای ئەم دانیشتنە (طفیل) گەڕایەوە ناوگەلەکەی‌و باوکی‌و دایکی‌و (ابو هریرة) موسڵمان بوون، دوای ئەم سیانە ساڵێك مایەوە کەس موسڵمان نەبوو... پاشان سەردانی پێغەمبەر(ﷺ) کردو پێی وت: (دوس) بیّ باوەڕن و ئیسلامیان



ناوێت، پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو دەست نوێژێکی گرت و دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، (طفيل) وایزانی نزای شەڕیان لێ دەکات بۆیە بە هەردوو دەستی دای بەسەری خۆیدا...پێغەمبەر(ﷺ) دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: خوایە هیدایەتی (دوس) بدەو بەکۆمەڵ ڕەوانەیان بکە بۆ لام... ئەوەبوو دوای ڕزگارکردنی خەیبەرو فەتحی مەککە پێغەمبەر(ﷺ) تەپ وتۆزێکی زۆری بینی ڕێگاکەی گرتبوو پرسیاری کرد ئەو کۆمەڵە کێن، وتیان: ئەوە هۆزی (دوس)ن وموسڵمان بوون و دێن بۆ پەیماندان!

## پەیمانی عەقەبەی یەکەم :

لەدوارۆژەکانی (تشريق)ی حەجی ئەوساڵە، تیرەو هۆزەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوە، پێغەمبەر(ﷺ)لەو ڕۆژەدا چاوی بە(٦)کەس لەدانیشتوانی (يثرب) کەوت، گەورەکەیان تەمەنی ٢١ساڵ بوو ئەویش (أسعد)ی کوڕی(زرارة ) بو کە لە(خزرج)ی (بني‌نجار) بوو..

پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون ئێوە کێن؟ وتیان: (خزرج)ین... وتی: ئێوە هاوپەیمانی جولەکەن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: تاوێك دانیشن هەندێك قسەتان بۆ بکەم..

ئینجا کەوتە باس کردنی ئیسلام و قورئان خوێندن..

لەدڵی خۆیاندا وتیان: وادیارە ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کەجولەکە هەڕەشەمان لێ دەکات پێی!!

جولەکە لەنێو (يثرب)دا هەڕەشەیان لەعەرەب دەکرد بەوەی کە کۆتا پێغەمبەر لەوان دەبێت و پەلاماری عەرەب دەدەن، ئەوان واگومانیان دەبرد کە پێغەمبەری چاوەڕوانکراو لە نەوەی (إسرائيل) دەبێت..

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) قسەکانی تەواو کرد (أسعد)ی کوڕی(زرارة ) وتی: ئێمە هاتوینەتە لات هیچ گەلێك نیە بەئەندازەی ئێمە دوژمنایەتی لەنێوانیادا هەبێت بەڵکو خوای گەورە بەهۆی تۆوە ئاشتەوایی بخاتە نێوانمان... ئینجا وتیان: ئەمساڵ دەگەڕێینەوە لەبەرئەوەی هەموومان لە(خزرج)ین ساڵی داهاتوو دەبێت (ئەوس)یشمان لەگەڵدا بێت هەتا پێت نەوترێت هەر پێغەمبەری(خزرج)یت!!

ئەوشەشەش کەسە موسڵمان بوون.. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لەساڵی داهاتوودا هەر لەم شوێنەدا لە(عقبة) بەیەك دەگەینەوە.

لەساڵی داهاتوودا گەڕانەوە مەککەو بووبوون بەدوانزە کەس ٨کەسیان لە (خزرج)و ٤کەسیان لە(أوس) بوون... پێغەمبەر(ﷺ) داوای پەیماندانی لێ کردن و ئەوانیش ئامادەیان دەربڕی بۆیە ناونرا پەیمانی (عقبة)ی یەکەم ...

◉ بەندەکانیشی بریتی بوون لە —

- هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدان.
- دزی نەکردن.
- داوێن پیسی نەکردن.
- منداڵ نەکوشتن.
- گوناهو خراپە نەکردن.
- کەم تەرخەمی نەکردن لە چاکەوچاکەکاریدا.

هەموو ئەمانە موسڵمان بوون و پێغەمبەر(ﷺ) نێردراوێکی خۆی لەگەڵدا ناردن بۆ مەدینە، ئەویش (مصعب)ی کوڕی(عمیر) بوو کەتەمەنی ٢٨ساڵ بوو ... (مصعب) گەنجێکی دەوڵەمەندو هەڵکەوتوو جوان پۆش بوو (مصعب) بەخۆشییەوە کۆچی کرد بۆ مەدینەو لە ماڵی (أسعد)ی کوڕی (زرارة) دا مایەوە،

مصعب لەنێو مەدینەدا کەوتە بانگەوازکردن بۆ ئیسلام ... بەمەش ئیسلام لە نێو مەدینەدا بڵاوبووەوەو بەدوایدا پەیوەندیەکانی نێوان (أوس)و (خزرج) بەرەو باش بوون دەچوو ....

(سعد)ی کوڕی(معاذ)و(أسید)ی کوڕی(خضیر) هەردوکیان سەرەك هۆزی ئەوس بوون، باسی (مصعب)یان بیست (سعد)داوای لە(أسید)کرد بڕوات ڕێگە لە(مصعب)و بانگەوازەکەی بگرێت، بەڵام (سعد) خۆی نەڕۆیشت لەبەرئەوەی توشی گرفت نەبێت لەگەڵ کوڕە پورەکەیدا.

(أسید) ڕۆیشت بۆلای (مصعب)و خەنجەرەکەی گرتبوو بەدەستیەوە کاتێك گەیشتە لای پێی وت: تۆکێیت هاتویتە لامان بانگەشە بۆ ئاینێکی تازە دەکەیت؟! بڕۆدەرەوە لە شارەکەمان!! ..

(مصعب) (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: باشە، حەز لەوە چاکتر ناکەیت؟! (أسید) وتی: مەبەستت چی‌یە؟، (مصعب) وتی: گوێم لێبگرە ئەگەر قسەکانت بەدڵ بوو ئەوا پێی ڕازی دەبیت، خۆ ئەگەر پێشت باش نەبوو ئەوا ئەم شوێنەت بۆ جێ‌دەهێڵم و دەڕۆمە دەر ..

(أسید) وتی: (واللە) قسەیەکی بەجێت کرد... ئینجا (مصعب) (خوای لێ ڕازی بێت) کەوتە خوێندنی قورئان، (مصعب) قورئانی دەخوێندو ڕوخساری (اسید) دەگۆڕا کاتێك تەواو بوو (أسید) وتی: چی دەڵێن کاتێك دەبنە پەیڕەوانی ئەم ئاینە..

(مصعب) وتی: خۆت دەشۆیت جل وپۆشاکت پاك دەکەیتەوەو پاشان شایەتی دەدەیت کە خوا زاتێکی تاك وتەنهایەو (محمد) پێغەمبەرو نێرراوی خوایە، لەوەودوا دوڕکات نوێژ بکە ... ئینجا (أسید) وتی: کەسایەتیەك هەیە ئەگەر



موسڵمان ببێت ئەوا هەموو تیرەو تایەفەکە بەشوێنیدا موسڵمان دەبن، ئەویش (سعد)ی کوڕی(معاذ)ە....

ئەوەبوو هەستاو ڕۆیشت بۆلای (سعد)ی کوڕی (معاذ) سەعد بەوەی کەلەگەڵیدا بوو وتی: (أسيد) هاتەوە، بەڵام بەو ڕوخسارەوە نیە کەسەرەتا لێرەوە ڕۆیشت ...

(اسيد) گەیشت و پێیان وت: چیت پێیە؟ وتی: پێم وتن واز بهێنن، ئەوانیش گوێرایەڵیان کردم... (سعد) زیرەك بوو سەیرێکی (أسيد)ی کردوو وتی: بابزانین، ئەوسا (سعد)ی کوڕی(معاذ) هەستاو ڕۆیشت بۆلای (مصعب)و هەمان گفتوگۆ کە لەنێوان (أسيد)و(مصعب)دا ڕویدا لەگەڵ (سعد)یشدا دوبارە بوەوەو (سعد) موسڵمان بوو... پاشان چوو بۆ لای (أوس)و وتی ڕاتان بەرامبەر گەورەکەتان چۆنە... وتیان: تۆ لەهەمووومان ژیرترو باشتریت، وتی قسەکردن لەگەڵ پیاوەکانتان و ژنەکانتان لەسەر من حەرامە هەتا باوەڕ بەخوای تاك و تەنها دێنن، ئیتر ئەوەبوو هەموویان موسڵمان بوون ...

### پەیمانی عەقەبەی گەورە :

لەوەرزی حەجی ساڵی داهاتوودا بەسەرۆکایەتی(براء)ی کوڕی(معرور) بەمەبەستی حەج ٧٣کەس لەمەدینەوە بەرەو مەککە کەوتنەڕێ، لەڕێگادا (جابر)ی کوڕی(عبدالله) موسڵمان بوو.. ئەو کۆمەڵە لەسەرەتای وەرزی حەجدا گەیشتنە شاری مەککە (مصعب)ی کوڕی(عمير) چاوی بە پێغەمبەر کەوت و هەواڵی پێدا کە ٧٣ کەسی لەگەڵدایە پاشان باسی بارودۆخ و حاڵیانی بۆ کرد... پێغەمبەر(ﷺ) داوای چاوپێکەوتنی (براء)کوڕی (معرور)ی کرد، ئەویش هاتە خزمەتیو (سعد)ی کوڕی(مالیك)ی لەگەڵدا بوو کە شاعیر بوو،

کاتێك (مصعب) بەپێغەمبەری ناساند پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی شاعیریت؟ ئەمەش ڕێزلێنانێك بوو بۆ (سعد)ی شاعیر...(سعد) وتی: بەڵێ (یارسول الله)، پێغەمبەر(ﷺ) بەخێرهاتنێکی گەرمی کردو زەردەخەنەیەکی شیرینی بەڕویدا پرژاند ...

دای ئەو دانیشتنە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی چاوی بە میوانانی ماڵی خوا بکەوێت کەلە ٧٣ موسڵمانی پیاوو ئافرەت پێك هاتبوون ... بۆئەوەی قوڕەیش هەستیان پێ‌نەکەن بڕیاریدا ئەو چاوپێکەوتنە لە کۆتا ڕۆژەکانی (مینا)دا بێت و لەنیوە شەودا لەلای (عقبة) بەڕێوە بچێت ... پێیان ڕاگەیاندن لەچادرەکانیاندا بێننەوە دووان دووان بێن هەتا قوڕەیش هەستیان پێ‌نەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە(ابو بکر)و (عمر) کرد لەسەر لوتکەی شاخەکە بێننەوەو چاودێری شوێنەکە بکەن..، ئەوسا پشتیوانان لە چادرەکانی خۆیان دەهاتنەدەر بەرەو عەقەبە بەمەبەستی چاوپێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەر((ﷺ)دا لەبەر گرنگی ئەو چاوپێکەوتنە پشتیوانان ئەو ڕۆژەیان لەڕۆژی بەدر لەلا بەنرختر بوو.. (کعب)ی‌کوڕی (مالك) دەڵێت: والله جەنگی بەدر لەنێو خەڵکیدا بەناو بانگترە لە پەیمانی (عقبة) بەڵام (عقبة ) لای ئێمەی پشتیوانان بە نرخترە..

لەم چاو پێکەوتنەدا ئافرەتان ئامادەیان هەبوو، بۆیە بەگرنگترین چاوپێکەوتنی سیاسی لەقەڵەم دەدرێت کەئافرەت ئامادەی بووبێ، (نسیبة)ی کچی (کعب)و (أسماء)ی کچی(عمرو) هاتبوون، لەگەڵ پێغەمبەریشدا(ﷺ) (عباس)ی مامی ئامادەبوو، (عباس) دەستی بەوتار کردو وتی: ئەی هۆزی (أوس)و (خزرج) بەهاتنی ئێوەمان زانی، دڵنیابن تا ئێستا ئێمەی نەوەی (هاشم) (محمد)مان پاراستووە، ئەگەر ئێوە دەتانەوێت بێتە لاتان ئەوا دەبێت پەیمانی

پاراستنی بدەن ئەگەر نا ئێمە دەتوانین پارێزگاری لێ بکەین .. ئەوسا پشتیوانان، وتیان: گوێمان لەوتارەکەت بوو ... چاك تێگەیشتین ..

**ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە خوێندنی قورئان وپاشان سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو هانی دان باوەڕی دامەزراوی پێبێنن و داوای لێ کردن لەسەر پێنج خاڵ پەیمانی بدەنێ :-**

**١-گوێڕادێری‌و گوێڕایەڵی لەخۆشی وناخۆشیدا لەکاتی چستوچالاکی‌دا، هەروەها سەختی‌و ناهەمواریدا.**

**٢- بەخشین لەکاتی دەستکورتی‌و نەداریدا، هەروەها لەکاتی بوون و دارابوندا.**

**٣- فەرمان بەچاکە کردن و بەرهەڵستی خراپە.**

**٤- لەپێناو خوادا لەلۆمەی لۆمەکاران بێ باك بن.**

**٥- پارێزگاری لێ بکەن وەك چۆن ئافرەت وماڵیان دەپارێزن .**

ئامادەبوان وتیان: چیمان دەست دەکەوێت ئەگەر ئەم پەیمانانەمان بردەسەر؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی بەهەشت! (براء)ی‌کوڕی( معرور) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەستت بێنە، یارسول الله سوێند بەوکەسەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردووە، چۆن ماڵ ومنداڵ و هاوسەرەکانمان دەپارێزین ئاوەهایش بەڕێزتان دەپارێزین، ئێمە کوڕی جەنگین و لەباوباپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە... پاشان کەسایەتیەکی تریان وتی: یارسول الله لەنێوان ئێمەو جولەکەدا پەیوەندی توندو تۆڵ لەئارادایە، ئێمە ئەوپەیوەندیە دەپچڕێنین، ئایا ئەگەر تۆ سەرکەوتیت و گەڕایتەوە ناو هۆزەکەی خۆت و جێت هێشتین ئێمە چی بکەین؟!

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوێنم تێکەڵی خوێنتانەو ناهەمواریو پشێویتان نا هەمواریو پشێوی منە، من لەگەڵتانم وئێوەش لەمنن، ئاشتەوایی دەکەم لەگەڵ ئەوەی ئاشت دەبن لەگەڵی، دوژمنایەتی ئەوانە دەکەم کەدوژمنایەتیتان دەکەن...ئەوسا هەرچی لەو دانیشتنەدابوو وتیان: دەستت بێنە باپەیمانت بدەینێ ... (أسعد)ی کوڕی(زرارة) هەڵساو وتی: سەیرکەن و بیربکەنەوەو ئێوە چ پەیمانێك دەدەن بەم پیاوە، ئێوە پەیمان لەسەر جەنگی عەرەب و عەجەم وڕەش و سپی دەدەنێ، ئەگەر پشتی بەردەدەن هەر ئێستە وازی لێ بهێنن.

کەچی هەموو وتیان: دەست مەهێنە ڕێمان ئەی (أسعد) بازرگانیەکەمان قازانجیە نەوازی لێدێنین، نەپشتی تێدەکەین ئیتر هەموو پەیمانیاندا.

پاشان دانیشتن، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ کردن ١٢کەس لە خۆیان هەڵبژێرن و ببنە بەرپرسی ئەوانی تر، ئەوەبوو ٩کەس لە(خزرج)و سێ لە(أوس) دیاری کرا کە لە نێوانیاندا: (عبدالله)ی کوڕی(حرام)و (أسعد)ی کوڕی (زرارة)و (براء)ی کوڕی (معرور)و (سعد)ی کوڕی(معاذ)و (أسید)ی کوڕی(خضیر)و هەندێکی تر هەبوون، ئینجا فەرمووی: ئێوە دەبنە زامنی ئەو خەڵکەی لەگەڵتانن و منیش زامنی سەرجەم ئوممەتم.

کۆبونەوەکە نزیك لە کۆتایی بوو، لەناکاو پیاوێك هاواری کرد: فریای (محمد)و ئەومێرد منداڵانە بکەون کە بۆ ئێوە کۆبونەتەوەو دەیانەوێت بجەنگێن دژتان .... بۆیە هەریەکە بەپەلە گەڕایەوە شوێنی خۆی ... لەبەیانیدا هەواڵەکە گەیشتە قوڕەیش، کە (محمد) لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکدا کۆبوەتەوە، ئیتر کەوتنە گەڕان بەنێو تیرەو هۆزەکانداو پرسیاریان لێدەکردن، بێ باوەڕانیش سوێندیان دەخوارد کە (محمد) یان نەبینیوە ...



کاتێکیش چوونە نێو، (یثرب)یەکان ئەوانەی بێئاگابوون سوێندیان دەخوارد کە (محمد) یان هەر نەدیوە...!!

دوای تەواو بوونی سروتەکانی ئەو کاتە، خەڵکەکە گەڕانەوە شوێن وشاری خۆیان، دوو کەس نەبێ دواکەوتن کە بریتی بوون لە: (سعد)ی کوڕی(عبادە)و (منذر)ی کوڕی (عمرو)، قورەیش پێیان زانین و هاتنە سەریان و گرتیانن و کەوتنە لێدانیان، (عباس) هات بۆلایان ولێی پرسین: کەس لەمانە بازرگانیەکەی بەنێوتاندا تێناپەڕێت؟ وتیان: با، ناوی چەند کەسێکیان وت کە (أبو سفیان)ی تێدا بوو، هاواریان لێ کرد، ئەویش هات بەدەمیانەوەو ڕزگاری کردن.

پاش ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە ئامادەکاری بۆ کۆچ، هاوەڵانی کۆکردەوەو باسی ڕێکەوتننامەی بۆ کردن و هەواڵی پەیماندانی پشتیوانانی پێدان و فەرمووی: خوای گەورە دەرویەکی لێکردونەتەوە لەماڵی خۆتان باشتر، خوای گەورە مۆڵەتی داوین بۆکۆچ...جا ئەوکاتە **پێغەمبەر(ﷺ)دەیویست سێ ئامانج مسۆگەر بکات :**

**یەکەم: گەیشتنی کۆچبەران بەسەلامەتی .**

**دووەم: زامن کردنی ڕێگای کۆچ ...**

**سێیەم: مسۆگەر کردنی دامەزراندنی موسڵمانان لەوێ .**

بۆ بەدیهاتنی ئەم ئامانجانە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لەهاوەڵە بەهێزەکان کرد لەگەڵ لاوازەکاندا کۆچ بکەن بۆیە دەوڵەمەندو بەهێزەکان لەگەڵ هەژارەکاندا بەرەو (یثرب) کەوتنەڕێ.... هەر لەبەرئەوە بوو کاتێك (عمر)ی کوڕی(خطاب) کۆچی کرد ٢٠ کەس لەموسڵمانە هەژارو لاوازەکان لە گەڵیدا کۆچیان کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ١٢بەرپرسەکەدا ڕێکەوت لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی کۆچبەران لە (یثرب) دا .



**چەند نمونەیەک لە گرفت و ئازاری هاوەڵان لە کۆچدا:**

لەو کەسانەی بوونە دەسپێکی کۆچ (أم سلمة)و هاوسەرو کوڕەکەی بوو، لەوکاتەدا کە لە ڕێگای کۆچدا بون کەس وکاری (أم سلمة) هاتن خۆیو کوڕەکەیان گرت و بەکێشمە کێش بردنیان و زیندانیان کردن، بەشێوەیەك شانی لەجێ چوو!! بۆیە باوکی (سلمة) خۆی بەتەنها کۆچی کرد... منداڵەکەشی لای خزمانی هاوسەرەکەی بوو بۆیە بێ‌منداڵ و بێ‌هاوسەر مایەوە یەك ساڵی تەواو، هەموو ڕۆژێك دەچوو لەو شوێنەی کە کوڕەکەیان لێ‌سەند دەگریا...هەتا ڕۆژێك پیاوێك لەکەس و کاری مێردەکەی بەو شوێنەدا تێپەڕی سەیری کرد، دەگری بۆیە هەوڵیدا تاکوڕەکەیان دایەوە...ئەوسا بڕیاریدا بەتەنها کۆچ بکات...لەوکاتەدا کە لە مەککە دەردەچوو، کابرایەك بەناوی (عثمان)ی کوڕی (طلحة) چاوی پێیان کەوت زۆر پێی گران بوو ئەم ئافرەتە بەتەنها سەفەر بکات، بۆیە بانگی کردو خستیە سەرپشتی وڵاخەکەیو بردی تا گەیاندیە (یثرب).

**( صهیب ) ی ڕۆمی :**

کاتێك (صهیب) خوا لێی ڕازی بێت، ویستی کۆچ بکات هاوەڵگەران هاتن و ڕێگەیان پێ‌گرت و وتیان: هاتیتە لای ئێمە هەژار بویت و هیچت نەبوو، ئێستەش ماڵ وسامانت پێکەوەناوە دەتەوێت هەروا بەئاسانی بۆی دەربچیت؟!(صهیب) وتی: چیتان دەوێت؟ وتیان ئەگەر دەتەوێت کۆچ بکەیت دەبێت سامانەکەتمان بدەیتێ! وتی: ئەگەر سامانەکەمتان بۆ جێ‌بهێڵم ڕێگەم دەدەن؟ وتیان: بەڵێ ... هەموو سامانەکەی بۆ دانان و کۆچی کرد، هەرچیەکی پێ‌بوو بردیان، تەنانەت وڵاخەکەیو عەباکەشی..پێغەمبەر(ﷺ) کە(صهیب)ی بینی فەرمووی: مامەڵەکەت قازانجی کرد خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نازڵ کرد

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ وَاللّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾(البقرة/ ٢٠٧)

واتە:هەندێ خەڵکیش هەن خۆیان دەفرۆشن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، خوای گەورەش بەسۆزو میهرەبانە بەرامبەر ئەو جۆرە بەندانەی.

## کۆچی(عمر) کوڕی(خطاب)خوای لێ ڕازی بێت :

کاتێك(عمر) ویستی کۆچ بکات تیروکەوانەکەی ئامادەکردو شمشێرو قەڵغانەکەی هەڵگرت و چووەناو (حرم)و(طواف)ی (کعبە)ی کرد، پاشان لەناوەڕاستی (حرم)داو لەبەردەم قوڕەیشدا وەستاو دوورکات نوێژی کرد، ئەوسا بەدەنگی بەرز وتی: ((ئەوەی دەیەوێت دایکی ڕۆڵە ڕۆی بۆ بکات و منداڵەکەی بێباوك بێت و هاوسەرەکەی بێوەژن بکەوێت، با بەیانی بێتە پشتی ئەو شیوەوە، چونکە من بڕیارم داوە کۆچ بکەم . لەو کاتەدا کەموسڵمانان بەنهێنی کۆچیان دەکرد(عیاش)ی کوڕی(ربیعە)و (هشام)ی کوڕی(عامر)ی لەگەڵدا بوو..(أبو جهل) خۆی گەیاندە لایان و بە(عیاش)ی وت: (عیاش) دایکت سوێندی خواردوە نان نەخوات و ئاو نەخواتەوەو خۆیشی نەشوات هەتا تۆ نەگەڕێیتەوە بۆ لای .

(عمر) پێی وت: ئەگەر ئەتەوێت بگەڕێیتەوە ئەمە ولاخەکەمە هەتا ببێتە یادگاری نێوانمان بەڵکو لەداهاتودا بگەڕێیتەوە ... کاتێك (عیاش) گەڕایەوە، هاوەڵگەران زیندانیان کردو ڕێگەیان نەدا دایکی ببینێت، پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی دەربارەی ئەوحاڵەتانە ڕەوانە فەرموو: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾(الزمر/ ٥٣)



واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئەی بەندەکانم..ئەوانەی کەخۆتان گوناهبار کردووەو هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لەڕەحمەتی خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست ودروست بکەن، خوا لەهەر هەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەوخوایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیەو زۆر بەسۆزو میهرەبانیشە.

ئەوسا (عمر) ئەم ئایەتەی بۆ (عیاش) نوسیو بۆی نارد، (عیاش) کەنامەکەی خوێندەوە دەستی کرد بەگریان و سواری وڵاخەکەی بوو، خۆی گەیاندە (مدینە ) .

## ۞ کۆچی پێغەمبەر ( ﷺ ) :

هاوەڵان بەرەو (یثرب) کۆچیان دەکرد پێغەمبەر(ﷺ) و(أبو بکر) مابونەوە، قورەیش دەیزانی کۆچی پێغەمبەرو موسڵمانان بۆ (یثرب)، یەعنی بەرپا کردنی دەسەڵاتێکی ئیسلامی لەو شارەدا هەروەها مەترسیشە لەسەر ڕێگای بازرگانی قورەیش بەرەو شام ...

بۆیە لەناو خۆیاندا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە: هەر هۆزەو پیاوێکی بەهێزی خۆی بهێنێ بەشمشێرێکەوە هەتا پێغەمبەر(ﷺ) بکوژن، ئەوکاتە خوێنەکەی لەنێو هۆزەکاندا ون دەبێت بە هەمووشیان خوێن بایی دەدەن!! چونکە نەوەی (هاشم) ناتوانن تۆڵەبسێننەوە... (جبریل) پێغەمبەری(ﷺ) لەنەخشەکە ئاگادار کردو فەرمووی: ئێستا ئیتر کاتی کۆچە ... بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتە لای ابوبکرو پێی فەرموو کاتی کۆچ کردن هاتووەو پێی ڕاگەیاند کە پێکەوە دەردەچن.

پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە(علی) ئامۆزای کرد کە لە جێگەکەیدا بمێنێتەوە هەتا ئەو ئەمانەتانەی لایەتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، سەیرە، حاڵی خەڵکی

مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) زۆر خراپ بوو خوێنیان حەڵاڵ کردبوو، لەو لایشەوە کەسیان لەو ئەمین تر دەست نەکەوت کەشتە بەنرخەکانیانی لا دابنێن.

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) (علی ) لەجێگەکەی خۆیدا دانا، لەماڵەکەی هاتە دەرو، مشتێك خۆڵی کرد بەچرووچاوی ئەوانەی کە دەوری ماڵەکەیان گەمارۆ دابوو، فەرمووی ڕوخسارە ناپاکەکان با کوێر بێت... ئیتر هەموویان خەویان لێ کەوت!! ئینجا چوو بۆ ماڵی ابو بکرو پێکەوە بەرەو ئەشکەوتی (ثور) کەدەکەوێتە باشوری مەککەوە ڕۆیشتن، هەرچەندە(مدینە) دەکەوێتە باکوری (مەککە )وە .. بێگومان ئەو کارەی لەبەرئەوە کرد تا قوڕەیش چەواشە بکات .

لەوکاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ئەشکەوتی (ثور) سەردەکەوت سەیرێکی مەککەی کردو ئەسرین لەدیدەی پیرۆزی باریو فەرموی: خوا دەزانێت خۆشەویسترین وڵاتی لەدڵما ئەگەر ئەوخەڵکە دەریان نەکردمایە هەرگیز دەرنەدەچووم ...

لەوساتانەدا کەبەسەر کێوەکەدا سەردەکەوت چەند ئایەتێك لەسورەتی (القصص) (٢٠-٢١، (٢٥) و (٨٥) نازڵ بوو بۆ دڵنەواییو بەخشینی خۆڕاگرییو دڵنیایی تەواو دەربارەی....، لەولاشەوە دڕندەکان لەبەردەرگای ماڵی پێغەمبەردا چاوەڕێ بوون، وایان دەزانی هەر لە ژورەوەیە، هەرچەندە خۆر هەڵهاتبوو، لەوکاتەدا پیاوێك بەلایاندا تێپەڕیو وتی: (محمد) هەر شەو لەماڵ هاتۆتە دەرو ڕۆیشتووە، ئەوانیش لەدەلاقەی دەرگاوە سەیری ژورەکەیان کرد وتیان: نەخێر وانیە ئەوەتە لەژێر جێگەکەیدایە، کاتێك لەچاوەڕوانی کردن بێزار بوون چونە ژورەوەو پێخەفەکەیان لادا سەیریان کرد (علی)کوڕی (أبو طالب)ە زۆر تورە بوون و پرسیاریان لێکرد بۆ کوێ ڕۆیشتووە؟! ، لەوەودوا بۆ ماڵی



(أبو بكر) .لەوێش تەنها (أسماء)ی کچی دەیزانی چونکە هەموو ڕۆژێك خواردنی بۆ دەبردن هەرچەندە دووگیانیش بوو ...

هەموو ئەو هەوڵ و ماندوبونانەی کەپێغەمبەر(ﷺ) دای گرنگی نەخشە وپلاندانان و گرتنەبەری هۆکارەکان دەردەخات.

پێغەمبەر(ﷺ) هەرچەندە (معجزە) خوایەکانی لەگەڵدا بوو، بەڵام هەروەکو موسڵمانێك بەناهەمواریو مەترسیەکانی کۆچدا تێپەڕی، هەتا گرنگی نەخشەدانانمان لەکاروباری ژیاندا بخاتە بەر چاوو تێمان بگەیەنێت گرتنەبەری هۆکارەکان و شل گیری نەکردن لە کارەکانماندا مەرجی سەرکەوتنمانە ...

## کۆچ ڕێڕەوی مێژووی گۆڕی ..

کۆچ گرنگترین قۆناغەکانی بانگەواز بوو، هەر لەبەر ئەوەشە مێژووی ئیسلامی لەکۆچەوە دەست پێ دەکات. چونکە کۆچ هێمای دیارو ئاشکرای سوروبونە لەسەر بانگەواز ... لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز ڕۆژی کۆچی بە ڕۆژی سەرکەوتن پێناسە کرد ﴿إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا فَأَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُواْ السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(التوبة / ٤٠)

واتە: ئەگەر ئێوە پشتگیری پێغەمبەر(ﷺ) نەکەن و یارمەتی نەدەن، ئەوە بەڕاستی خوا پشتگیری کردو سەری خست، کاتێك ئەوانەی بێباوەڕبوون دەریان کرد لەشاری مەککەو یەکێك بوو لەو دووکەسە کاتێك هەردووکیان لەناو ئەشکەوتەدابوون پێغەمبەریش(ﷺ) دڵی دایەوەو پێی وت: خەفەت مەخۆ، دڵنیابە خوامان لەگەڵە، ئەوسا ئیتر خوا ئاسودەیو ئارامی خۆی دابەزاندە



سەری‌و پشتگیری‌و بەهێزی کرد بەسەربازانێك کەئێوە نەتاندەبینین و بەرنامەو ئاینی بێ باوەڕانی دانەواندو ڕیسواتری کرد، بەرنامەو ئاینی خوایش هەمیشە بەرزو بلّندترە، خوایش هەمیشە بالاّدەست و دانایە.

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەلّ (أبوبکر)ی هاوەلّیدا گەیشتنە ئەشکەوتەکە، بێگومان ئەو ئەشکەوتە سەرەتای گۆڕانکاری‌و دەسپێکی سەرکەوتنەکان بوو...

هەروەکو یارانی ئەشکەوت ڕەحمەت ومیهری خوایی داباری بۆسەر پێغەمبەرو هاوەلّەکەی، سەرەتای سەرکەوتن لەئەشکەوتی تەنگەبەرەوە دەستی پی‌کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) سێ ڕۆژ لەو ئەشکەوتەدا مایەوە هەتا قورەیش لەگەڕان بەدوایدا بێزار بن و بڕۆن بەم لاولادا!!

هەرچەندە گەیشتنە ئەشکەوتەکەش، (أبو جهل) و(عتبة)و (شيبة) لەبەردەرگای ئەشکەوتەکەدا وەستان، خوا کوێری کردن، پێغەمبەرو (أبوبکر)یان بەدی نەکرد.

(أبوبکر) دەگێڕێتەوە کە بەپێغەمبەری(ﷺ)فەرمووە: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێکیان سەیری بەرپێی خۆی بکات دەمانبینێت،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی (أبوبکر) نیگەران مەبە، ڕات چۆنە بەرامبەر بە دووکەس خوای گەورە سێیەمیان بێت؟!

پێغەمبەر(ﷺ)ماندوو بوو سەری نایەوە لەکۆشی (أبو بکر)داو خەوی لێ‌کەوت، لەوکاتەدا مێرویەك دای بەقاچی (أبوبکر)ەوەو، (ئەسرین)لەچاوانی هاتە خوارەوەو کەوتە سەر گۆنای پیرۆزی پێغەمبەری خوا(ﷺ)،بۆیە لەخەوبێدار بوەوەو فەرمووی: ئەوەچیتە (أبوبکر)؟ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری



خوا شتێك پێوەیدام!! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی بۆ بەئاگات نەهێنامەوە؟ (أبوبكر) فەرمووی: ویستم زیاتر بنویت و بحەوێیتەوە ...

بێگومان ئەمە خۆشەویستی لەڕادەبەدەری (أبوبكر) دەردەخات بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دواتریش لە ڕێگای کۆچدا پێغەمبەر(ﷺ)تینوی بوو (أبوبكر) کەمێك شیری پێ بوو دای بەپێغەمبەر(ﷺ).

(عمر) دەڵێت: (والله) یەك شەو لەشەوەکانی(أبوبكر) چاکترە بە پڕی زەوی لە(عمر)وکەسوکاری(عمر)بەڵێ، دوای ئەوەی قوڕەیش نائومێد بوون لە دۆزینەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵی ڕێزداری، هاتنە خوارەوەو ڕۆیشتنە سەر ڕێگای کۆچ بەڵام ڕێگایەکی دوور لە هاتوچۆی کاروانەکان، هەتا کەس نەیانبینێت ...

قوڕەیش خەڵاتێکی گەورەی بڕیاردا: هەرکەس (محمد)بەزیندووی یان مردوویی بدۆزێتەوە(١٠٠) وشتر خەڵات دەکرێت!! (سراقة)ی کوڕی (مالك) بەئومێدی ئەو خەڵاتە خۆی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) (أبوبكر) بینی، بەپێغەمبەری خوای وت: (یارسول الله) ئەسپ سوارێك لەپشتمانەوەیە، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: خوایەگیان فریامان بکەوە بەوەی دەتەوێت و چۆن دەتەوێت، (سراقە) لەدوای ئەو نزایەی پێغەمبەر(ﷺ)لەئەسپەکەی کەوتەخوار بەڵام دووبارە سەرکەوتەوە، بۆ جاری دووەم پێغەمبەر(ﷺ) هەمان نزای لێکردو ئەمجارەیان لەئەسپەکەی کەوتە خوارەوەو چوار پەلی ئەسپەکەی ڕۆچوو لەخاکدا، (سراقە) تەسلیم بوو، پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرموو: موسڵمان دەبیت ئەگەر بازنەکانی کیسرات بدەمێ؟! بازنەکانی کیسرام دەدەیتێ لەکاتێکدا کە تۆ لەمەککە دەربەدەریت؟! سەرنجی ئەو متمانەیە بکەن کە پێغەمبەر(ﷺ)بەوادەی



خوای گەورە بویەتی. هەرچەندێك ئاستەنگەکان زۆریش بن هەرسەرکەوتن بۆ ئەو دەبێت... (سراقة) بەپێغەمبەری وت: ئەم وادەیەم بۆ دەنوسیت؟ فەرمووی: بەڵێ...ئەوەبوو نوسراوی ئەو وادەیەی پێدا!!

دوای ئەوەی (سراقە) موسڵمان بوو، پێغەمبەری خواو (ابوبکر)یش کۆچی دواییان کرد..

سوراقە هەر بەئاواتەکەی نەگەیشت، تا لەسەردەمی خەلیفە (عمر)دا وڵاتی فارس ئازاد کرا، موسڵمانان دەستکەوتێکی زۆریان دەست کەوت و بردیانە خزمەت ئەمیری بڕواداران (عمر) ی کوڕی (خطاب) ئەویش یەکسەر پرسی کوا (سراقة)!! بۆیان بانگ کردو فەرمووی: (سراقة) پێغەمبەر(ﷺ) وادەی پێدای کەبازنەکانی کیسرات لەدەست بکات، وەرە با بیکەمە دەستت، ئەوسا هەرچی لە مزگەوتەکەدا بوو دەستی کرد بەگریان چونکە هەموویان بارودۆخی ئەو وادەیەیان هاتەوە یاد!!

### دابەزینی پێغەمبەر (ﷺ) لە قباء :

پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە (قباء) کەشارۆچکەیەکی تەنیشت(مدینە)یە ١٠کیلۆمەتر لەمزگەوتەکەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)دورە، ٤ڕۆژ لەوێ مایەوە... بەمەش کۆچی پێغەمبەر(ﷺ)لەوڕۆژەوەی مەککەی بەجێهێشت تا گەیشتە مەدینە ١٤ ڕۆژی خایاند ..

### دروستکردنی یەکەم مزگەوت ..

پێغەمبەر(ﷺ) لە(قباء) یەکەم مزگەوتی لەگەڵ هاوەڵاندا دروست کرد بەردەوامیش هەفتەی جارێك سەردانی دەکردو دەیفەرموو: (هەرکەسێ لەماڵەکەی خۆیدا دەست نوێژ بگرێت وپاشان بێتە مزگەوتی (قباء)و دورکات



نوێژی تیادا بکات پاداشتی عەمرەیەکی دەست دەکەوێت... چونکە ئەو مزگەوتە ئایەتی لەبارەوە نازڵ بووە.

**گەیشتنی ( علی ) کوڕی ( أبو طالب ) ..**

دوای ئەوەی (علی) سەرجەم ئەمانەتەکانی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان لە (قباء) خۆی گەیاند بە پێغەمبەر(ﷺ)...

نەعلەکانی دڕابوون و قاچەکانی خوێناویو ئاوساو بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئارامی نەبوو هەتا بەچاوی خۆی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیو لەسەلامەتی دڵنیا بوو...

لەوکاتەدا (علی) گەیشتە (قباء) پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵناوایدابوو کە (علی) بینی زۆر بەزەیی پیادا هاتەوە...

پاشان (زبیر)ی کوڕی( عوام)یش خۆی گەیاندە (قباء)و دوو دەست جلی پاکی هێنابوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و (أبوبکر) هەتا بەجوانترین شێوەو ڕوخسار دەرکەوێت.

**۞ گەیشتن بە( مدینە) :**

چەندڕۆژێك سەراپای خەڵکی (مدینە) چاوەڕوانی گەیشتنی پێغەمبەریان (ﷺ) دەکرد.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)گەیشتە قەراغ شار پیاوێکی جولەکە کە بەسەر دارخورماکەیەوە بوو ٤کەسی لەدورەوە بەدی کرد، کەبریتی بوون لە: پێغەمبەر(ﷺ) و(أبوبکر)و (علی)و(زبیر)، دەستی کرد بەهاوارکردن وتی: عەرەبینە خۆزگەو ئاواتەکەتان هاتە دی ...



هەر کەخەڵکی هەواڵەکەیان بیست ( الله أکبر و لاإله إلا الله) دەنگی دەدایەوە .

(أنس)ی کوڕی(مالك) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی دوو شەمە گەیشت و جیهانی ڕووناك کردەوە، هەر لەڕۆژی دووشەمەشدا کۆچی دوایی کردو جیهان بەوەفاتی تاریك بوو.

شایانی باسە (مدینە) تاکە شوێنێکە لەسەر زەوی کە چەند پارچەیەك لەبەهەشتی تیایە: کێوی (أحد)و (بقیع)و ئارامگای پێغەمبەر(ﷺ) هەریەکەیان بەشێکن لەبەهەشت.

کەپێغەمبەر(ﷺ) هاتە نێو شار زۆربەی خەڵکی نەیاندەناسی، بۆیە هەندێکیان ڕەشمەی ووشترەکەی (ابوبکر)یان گرت وایاندەزانی پێغەمبەرە(ﷺ)، بۆیە خێرا عەباکەی لەشانی داماڵی‌و کردی بەسێبەر بۆ پێغەمبەر(ﷺ)...

خەڵکی مەدینە لەشوێنێکدا بەپێغەمبەر(ﷺ)گەیشتن پێی دەوترێت (ثنیة الوداع) کەشوێنێکی ناسراوو بەرچاوی شارەکەیەو بەم هۆنراوەیە پێشوازیان لێکرد:

طلع البدر علینا — من ثنیة الوداع
وجب الشکر علینا — مادعا لله داع
ایها المبعوث فینا — جئت بالأمر المطاع
جئت شرفت المدینة — مرحبا یا خیر داع

واتە :

وا مانگی چواردە هەڵهات لە ئێمە
لەکەلێنی (ثنیات الوداع) ەوە
سوپاسگوزاری ئەرکە لەسەرمان

هەتا بانگخوازێك بانگ بكا بۆ لای خوا

ئەی ئەوکەسەی ڕەوانەکراوی بۆ نێومان

تۆ ئەرك وفەرمانێكت هێناوە هەموومان بۆی فەرمانبەردارین

تۆ هاتویت وشاری مەدینەت پیرۆز کرد

سڵاوت لێ بێت ئەی چاکترین بانگخواز

دیارە ئەم چوارینەیە کە لەوەوپێش ئامادەنەکرا بوو بەڵکو هەرلەوێدا هاتە سەرزاری خەڵکیو پیاوو ژن و پیرو گەنج دەیانوتەوە.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)هاتە نێو شارەوە، هەریەکە، دەیویست ووشترەکەی بۆلای خۆی ڕابکێشێت تا لای بمێنێتەوە،..بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی وازی لێبێنن خۆی فەرمان پێکراوە، ئیتر ئەوەبوو ووشترەکە لەشوێنێکدا یخی‌داو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەم شوێنەدا دادەنیشین کەدواتر کرا بەمزگەوت ئەوشوێنەش (بنی نجار)ی خاڵوانی پێغەمبەر(ﷺ) خاوەنی بوون!!..

### یەکەم وتار لەمەدینەدا:

بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر خەڵکیدا ، چاوەڕێی فەرمایشتی پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد، ئەویش هەستاو فەرمووی: خەڵکینە سەلام و ئاشتی لەنێوتانا پەخش بکەن، خۆراك بەهەژاران ببەخشن، پەیوەندی خزمایەتی پتەو ڕابگرن، ئەو کاتەی خەڵکی نوستون هەڵسن بۆ شەونوێژ، دەچنە بەهەشتی خواوە بەسەلامەتی ...



**یثربـ)ی ئەوساو ( مدینە )ی ئێستا :**

(یثرب) شارێك بوو جەنگی ناوخۆی نێوان (أوس)و (خزرج) تەواو شەکەت و ماندووی کردبوو هەروەها جولەکەیش وەك خاوەنی ئاینێکی جیاواز لەم شارەدا دەژیان، موسڵمانە کۆچ بەرەکانیش هاتبوونە نێو ئەو پێکهاتە ئاڵۆزەوەو باری بژێویشیان زۆر لاواز بوو، لەکاتێکدا لەشاری خۆیاندا زۆربەیان دەوڵەمەند بوون بەڵام لەمەدینەدا بێ‌خانەولانەو خۆراك بوون.. بۆیە ئەووتارە کورتە هەمەلایەنەیە لەبواری ئاینیوسیاسیو کۆمەڵایەتیو ئیمانیو ڕۆحیدا کاریگەری خۆی هەبوو، خەڵکینە سەلام و ئاشتی بەرقەرار بکەن واتە باجەنگی ناخۆش بەس بێت، خۆراك بدەن بەیەکتر ئەمەش مەبەستی یارمەتیدانی کۆچبەران بوو هەتا برسی نەبن، پەیوەندی خزمایەتیتان پتەو بکەن ئەمەش بانگەوازێك بوو بۆ کۆکردنەوەو ئاشتکردنەوەی (أوس)و(خزرج)، کاتێکیش فەرمووی لەوکاتەدا کەخەڵکی نوستوون نوێژ بکەن، لەبەرئەوەی ئەوان پێویستیان بەوزەیەکی ڕۆحی هەیە هەتا بتوانن بەم کارانە هەستن ...

**دابەزینی پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵی ( أبو أیوب الأنصاري)دا ...**

لەوکاتەدا کە پێغەمبەر وتاری دەدا (أبو أیوب الأنصاري ) شمەك و کەل و پەلی پێغەمبەری برد بۆ ماڵی خۆیان، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)پرسیاری لەکەل وپەلەکەی کردو زانی کە ئەو بردوویەتی بۆ ماڵی خۆیان، ماوەی مانگێك لەماڵیاندا مایەوە ...

ماڵەکەی دوو نهۆم بوو(أبو أیوب) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەز دەکەم بەڕێزتان لەنهۆمی سەرەوەبن، پێغەمبەر(ﷺ) قبوڵی نەکرد لەبەرئەوەی دەیزانی کەسەردانی زۆردەکرێت، ئەوسا ئیتر (أبو أیوب) و هاوسەرەکەی چوونە سەرەوە

پێغەمبەر (ﷺ)لە نهۆمی خوارەوەدا نیشتەجێبوو، (أبو أیوب) وخێزانەکەی لەسەر نوکی پەنجە بەناو ماڵەکەیاندا ڕێیان دەکرد نەبادا پێغەمبەری خوا نیگەران و بێزار بکەن.. ڕۆژێك (أم أیوب) گۆزە ئاوەکەی بەدەستەوە شکاو ئاوەکە ڕۆچوو بۆ ژوورەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ئەوانیش تەنها یەك بەتانیان هەبوو دنیا زۆر ساردیش بوو بەناچاری دایان بەسەر ئاوە ڕژاوەکەدا هەتا نەڕژێت نەچۆڕێتە خوارەوە پاشان بۆ بەیانی داوایان لەپێغەمبەری خوا کرد کە تەشریفیان بچێتە سەرەوەو خۆیان لەخوارەوە بن ...

هەموو ڕۆژێکیش خواردنیان دەنارده خزمەتی خۆیان لێیان نەدەخوارد، پاشان لەپاش ماوەکەیان دەخواردو بە دوای شوێن پەنجەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)دەگەڕان تا بۆ موبارەکی بیخۆن ...

(أبوأیوب) هەتا کۆتاییەکانی سەردەمی (عمر)ی کوڕی(خطاب) مایەوەو هەر جیهادو تێکۆشانی دەکرد تا شەهید کراو لەژێر دیواری قەڵاکانی قوستەنتینیەدا نێژرا.

### بارودۆخی مەدینە لەکاتی کۆچ دا ....

لەوکاتەوەی کۆچبەران هاتنە نێو مەدینە، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئەم شارە گۆڕانی بەسەردا هات... کۆچبەران هەژارو نەدار بوون، چونکە ماڵ و سامانیان لەمەککەدا جێ هێشتبوو لەگەڵ ئەوەشدا هەستیان بەنامۆیی دەکرد... بەردەوامیش ژمارەیان ڕوو لەزیادی بوو، خەڵکی مەککە شارەزاییان لەبازرگانیدا هەبوو بەڵام مەدینەییەکان سەرقاڵی کشتوکاڵ بون، کەواتە خەڵکی مەککە هیچیان لەکشتوکاڵ نەدەزانی، شایانی باسە لەمەدینەدا گرووپی دووڕووەکان پەیدا بوو، ئەوانەی بەڕوکەش ئیسلامیان وەرگرتبوو بەڵام لەژێرەوە



دوژمنایەتی‌یان دەکردو پیلانیان لەدژی دەگێڕا.. هەموو ئەمانە ئاماژەیەکی دیارن کە کۆمەڵگەی مەدینە لەسەرەتاوە کۆمەڵگەیەکی ئاڵۆز بوو، بەڵام پێغەمبەر چەند هەنگاوێکی نا بۆ لەباربردنی ئەو بەربەستانە لەوانە :

**١-بنیاتنانی مزگەوت ...**

یەکەم کارێك کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی هەستا بنیاتنانی مزگەوت بوو، مزگەوت گرنگیەکی زۆری هەیە لە دروستبوونی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا چونکە ئەندامانی نێو کۆمەڵگە لەیەکتر نزیك دەکاتەوەو پەیوەندی نێوانیان تۆکمە دەکات و جیاوازیە چینایەتیەکان لەنێو دەبات... چونکە مزگەوت تەنها شوێنی خواپەرستی نیە، بەڵکو سەکۆیەکیشە بۆ ڕاگەیاندن... بۆیە بووە یەکەم هۆکار لەچارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا...

**٢-برایەتی نێوان موسڵمانان**

هەنگاوی دووەم کەپێغەمبەر(ﷺ) نای بۆ دەربازبوون لەکێشەکۆمەڵایەتیەکان سازاندنی برایەتی نێوان کۆچبەران و پشتیوانان بوو، هەر کۆچبەرێکی کرد بەبرای پشتیوانێك، بەمەش موسڵمانان لەیەك قاڵبدا توانەوە ئەویش: خۆشەویستی بۆ خواو لەبەر خوا..

**٣- ڕاگەیاندنی دەستورێک بۆ مەدینە..**

گرنگترین ئەو خاڵانەی کە دەستوری لێ پێکهاتبوو، ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان خودی باوەڕداران لەلایەك وەموسڵمانان و جولەکەکانی مەدینە لەلایەکی ترەوە.



أ-بەندی یەکەم : موسڵمانانی قورەیش و(یثرب) و ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن یەك ئوممەتن واتە هەموویان لەئەرك و بەرپرسیاریەتیدا یەکسانن بێ جیاوازی و جیاکاری ..

ب-بەندی دووەم : جولەکەی (بنی عوف) و جولەکەی (أوس) و ئەوانەی تر لە جولەکەکانی مەدینە یەك ئوممەتن لەگەڵ موسڵماناندا مەگەر ئەوەی ستەم وگوناه بکات .

ج- بەندی سێهەم: خەرجی ئەکەوێتە سەر جولەکەو سەر موسڵمانانیش هەرکارتێك جەنگ لە دژی ئەو لایەنانە بەرپا کرا کە پابەندی ئەم دەستورەن، بێگومان دەبێت ئامۆژگاری و چاکە بکەن و دووربن لە خراپەکردن، هەروەها جولەکە خاوەنی ئاینی خۆیانن و موسڵمانانیش خاوەنی ئاینی خۆیانن .

د-بەندی چوارەم:

ئەم بەندە بریتی بوو لەرێسای گشتی ولات بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی ناوخۆ کە تیایدا هاتووە: کەس بۆی نیە لەمەدینە برواتە دەر بۆ بەرپاکردنی جەنگ یاخود دوژمنێك بێنێتە سەر مەدینە بێ مۆڵەت و پرسی پێغەمبەر (ﷺ)جا لە جوانترین تایبەمەندیەکانی ئەم دەستورە ئەوەیە کە خەڵکی کۆدەکاتەوەو پەرتەوازەیان ناکات، هەموو خەڵکی لەگەڵ یەکدان، کەسی لە پەراوێزدا دانەناوەو کەسیشی لەمافەکانی خۆی بێ بەش نەکردووە... هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بەکارێکی زۆر گرنگ هەڵسا ئەویش گۆڕینی ناوی (یثرب) بوو، ئەگەر ناوی بەکۆچبەرانەوە بوایە ئەوا تەنها دەبووە شاری (کۆچبەران )، خۆ ئەگەر ناوی بنایە دەوڵەتی (محمد)ی ئەوا تەنها دەبوە دەوڵەتی موسڵمانان...



بۆیە ناوی نا (مەدینە) ناوێکە بۆ سەرجەم دانیشتوانی مەدینە بشێ و ئاماژەش بێت بۆ مەدەنیەت و شارستانی و پرۆژەی پێکەوە ژیان لەسایەی ئەم ئاینەدا ...

### ☾ ڕەهەندە ئیجابیەکان لە کۆمەڵگەی مەدینەدا ...

کۆمەڵگەی مەدینە خاوەنی چەند ڕەهەندێك بوو: لەوانە ڕەهەندی خێرخوازی، بۆ نمونە ڕۆژێك میوانێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، کاتی نان خواردن هەواڵی نارد بۆ ماڵەکانی لەهیچ کام لە ماڵەکانیدا ژەمێکی خۆراك نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) ڕوی کردە هاوەڵان و پرسی کێ ئەم پیاوە دەکاتە میوانی خۆی، یەکێك لە پشتیوانان ئامادەیی دەربڕی، هەرچەندە خۆیشی هەژار بوو، کەمێك خۆراکیان هەبوو بۆ منداڵەکانیان کەچی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بڕیاریاندا کە منداڵەکانیان بخەوێنن و ڕوناکی ماڵەکە خامۆش بکەن، هەتا میوانەکە خواردنەکە نەبینێ، کارێکیش بکەن کە میوانەکەیان وابزانێت لەگەڵیدا دەخۆن..

هەربۆیە ئەم ئایەتە هات کەوەسفی ئەوان و هاوڕێنەیان دەکات: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (الحشر/٩)دوایی کەچوونەوە بۆ مزگەوت پێغەمبەر(ﷺ) بەخاوەن ماڵی فەرموو: خوای گەورە شانازی دەکات بەو میوانداریەی ئەم ئێوارەیەتان ...

### ئیماندارانی (صفە)و قورئان خوێنان :

ژمارەی خەڵکی (صفة) لەمەدینەدا گەیشتبوونە ٢٠٠کەس، کۆمەڵگەش هەژاربوو، لەبەرئەوە دەبوو خاوەن پارەو سامانەکان بەرۆڵی کۆمەك و هاوکاری خۆیان هەڵسن .

بۆئەو مەبەستە (عثمان) بیری ڕۆمەی کڕی هەتا موسڵمانان بەخۆڕایی سودی لێوەربگرن ...هەروەها قورئان خوێنان کە ژمارەیان ٧٠کەس دەبوو بەیانیان دەچوونە سەرکارو پیشەی هەمەجۆریان دەکردو شەویش قورئانیان لەبەردەکرد.

پاشان بەدوای ئەمەدا فەرزەکان یەك بەدوای یەکدا کەوتە سەرشانی خەڵکی مەدینە، ڕۆژوگرتن فەرزکرا، بالاپۆشیو زەکاتیش بەدوایدا فەرزکرا هەروەها بانگ بۆ دیاری کردنی کاتەکانی نوێژ پەسەند کرا...

هەرچەندە زۆربەی هاوەڵان هەژاربوون بەڵام ورەیان بەرزبوو چونکە دڵنیا بوون کە سەرکردەو پێشەواکەیان(ﷺ) وەکو ئەوان دەژی و هەمان ئاستی بژێوی هەیە، جارێك یەکێك لە هاوەڵان چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، لەبرسا بەردێکی بەسکیەوە بەستبوو وتی: یا(رسول الله) سەیری سکم بکە لەبرسانا چیم لێ کردووە پێغەمبەریش سەیرێکی کرد بەزەردەخەنەوەو ئەویش سکی خۆی نیشان دا، سەیری کرد ئەو دوو بەردی بەسکی خۆیەوە بەستوە!! پێغەمبەر(ﷺ) چەندین جار دوو مانگ لەسەر یەك لەماڵیدا ئاگر نەدەکرایەوە! تەنها ئاوو خورمایان هەبوو، بێگومان بەم کردەوانە بووە پێشەنگێکی نموونەیی بۆهاوەڵان ...

## قۆناغێکی نوێ لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ناحەقیدا:

ڕووبەڕوو بوونەوەی نێوان حەق و ناحەق لە (مەککە )دا تاڕادەیەك بەکۆچ کۆتایی پێ هات، بەڵام لەمەدینە شێوازێکی تری بەخۆیەوە بینی قۆناغی خۆسەلماندن و بەرگری دەستی پێکرد، بۆ چەسپاندنی حەق لەدژی ناحەق (جیهاد)ی چەکداری هاتە ناو کە لە ئیسلامدا بۆلابردنی ئەو کۆسپانەیە کە



نایەڵن خەڵکی ئازاد بن، نایەڵن دەنگی ڕەوای ئیسلامەتی بدرێ بەگوێی خەڵکیدا، ئەمڕۆ بەناوی جەنگی دژە تیرۆرەوە خودی ئیسلام تاوانبار کراوەو دژایەتی دەکرێت... بۆیە پێویستە تێگەیشتوان لە ئیسلام ڕووی گەش و شارستانی ئەم ئاینە بخەنەڕوو کە هەمووی ڕەحمەت و سۆزو میهرە بۆ هەردوو جیهان ئەوەتە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەرەتای هاتنە ناو مەدینەی دا ئاشتی دەڕوێنێت لەناو دڵەکانداو.. لەکۆی ١٧جەنگ کەناحەزان بەرپایان کرد نزیکەی ٤٠٠ کەس کوژرا بەڵام لەجەنگی جیهانی یەکەمدا ١٥ملیۆن کەس تیاچوو لە دووەم دا نزیکەی ٦٥ملیۆن کەس!! بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککەداهەر دانی بە خۆدا گرت یەك قەترە خوێنی هاوەڵگەرانی نەڕژاند ... کەواتە (جیهاد) بەهۆی گەیاندنی بانگەوازەوە ڕوویدا وەکاتێ دەستی پێ‌کرد کەهاوەڵگەران ڕێگەیان نەئەدا ئەم بانگە حەقە بگات بەخەڵك.

## گۆڕینی ڕووگە :

گۆڕینی ڕووگە (القبلة) هەرلە (مدینە)دا ڕوویدا، ڕووگە لە (بیت المقدس)ەوە گۆڕا بۆ(البیت الحرام) ... ئەگەر گۆڕینی ڕووگە ڕەهەندێکی پەرستشیانەی بووبێت ، بێگومان ڕەهەندێکی ستراتیژیانەیشی هەیە...

پێغەمبەر(ﷺ)تەواو دەرکی کردبوو بەو ڕاستی‌یەی کە ململانێ کۆتایی نایەت، جەنگێك لە داهاتوودا بەرپا دەبێت. ئەو دەیویست پەیامی پەروەردگار بگەیەنێت قورەیش یش دەیویست پێشەوایەتی عەرەب لەدەست نەدات بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەسێ هەنگاو دەست پێشخەری کرد :

**یەکەم:** ئامارێکی ئەنجام دا بۆ زانینی ژمارەی موسڵمانان بە گشتی و ئەوانەیان کە دەتوانن چەك هەڵبگرن بەتایبەتی بۆ هەڵسەنگاندنی تواناکان، هەروەها سەرژمێری ئەوانەشی کرد کە دەتوانن بنوسن و بخوێننەوە ..

**دووەم:** دەرچوون و گەڕان و سەردانی تیرەو هۆزەکانی نێوان مەککەو (مدینە)، جا لەو کەسانەی پێشەوایەتی ئەو کارەیان دەکرد (سعیدی کوڕی زبیر)و (طلحةی کوڕی عبید الله )بوون، ئەمەش ماوەی دووساڵی خایاند، سەردانی هەموو تیرەو هۆزەکانی ئەو ناوچانەیان کردو قەناعەتیان پێ کردن بەبێ لایەنی بمێننەوە لە نێوان ململانێی نێوان موسڵمانان و هاوەڵگەراندا ...

**ئامادەسازی بۆ جەنگی بەدر :**

دوو مانگ پێش جەنگی بەدر پێغەمبەر(ﷺ)دەستەیەکی لە موسڵمانان بە پێشەوایەتی (عبداللّٰه)ی کوڕی (جەحش) نارد لەگەڵ (٨٠)کەسدا بەنامەیەکی داخراوەوە، فەرمانی پێدا دوو ڕۆژ بڕوات، پاشان نامەکە بکاتەوە ..

(عبداللّٰه) دوای دووڕۆژ نامەکەی کردەوە سەیری کرد نوسراوە ئەگەر سەیری نامەکەت کرد بەردەوام بە لەڕێگاکەت تادەگەیتە باخێکی دارخورما کە دەکەوێتە نێوان مەککەو(طائف) لەوێدا هەواڵی قوڕەیشم بەووردی بۆ کۆبکەرەوە، بەڵام زۆر لەهاوەڵەکانت نەکەی لەگەڵتا بێن بۆ ئەو شوێنە..

شایانی باسە پێغەمبەر(ﷺ) لەمانگە حەرامەکاندا (عبداللّٰه)و هاوەڵانی نارد هەتا ڕووبەڕووی جەنگ نەبن لەگەڵ قوڕەیشدا.... دووکەسیان ولاّخەکەیان لێ وون بوو ئەوانیش ڕۆیشتن تا بیاندۆزنەوە، لەڕێگادا قوڕەیش بەدیلیان گرتن یەکێك لەو دوانە (سعد)ی کوڕی أبو (وقاص)بوو ... لەهەمان کاتدا کاروانێکی (قریش)بەوناوەدا تێپەڕی، ئەوەی کەمابوونەوە (عمرو کوڕی حضرمی ) پێشەوایەتی کردن لەسەر ئەوە ڕێکەوتن ئەوانیش دیل لە قوڕەیش بگرن، بۆیە لە چەند لایەکەوە تیر هاوێژەکانیان کەوتنە گیانی کاروانەکەو دووکەسیان لە قوڕەیش بەدیل گرت و (عمرو) شەهید کراو دووان لە هاوەڵگەران بەدیل گیران و بردیانن بۆ (مەدینە) قوڕەیش ئەم ڕووداوەیان قۆستەوەو وتیان: موسڵمانان لەمانگە حەرامەکاندا خەڵك دەکوژن. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەم ڕووداوە نیگەران بوو فەرمووی من نەم وت دەست بپارێزن وکەس نەکوژن.

## جەنگی بەدر :

جەنگی بەدر یەکەم ڕووبەڕووبونەوەی نێوان موسڵمانان و هاوەڵگەران بوو، خوای گەورە ناوی نا(الفرقان) لەبەرئەوەی حەق و ناحەقی جیاکردەوە لەڕاستیدا جەنگی بەدر جیاکەرەوەی ڕەواو نارەوا بوو، جیاکەرەوەی بەرژەوەندیە تایبەتی‌یەکان و بەرژەوەندیە گشتی‌یەکان دابوو، سەرخستنی ڕاستی‌و دادپەروەری بوو.

قورەیش کاروانێکی بەهەزار ولآخ و ٥٠ هەزار دینار زێڕەوە لەوبازرگانیەدا ناردبوو بۆ شام سەر کاروانی ئەم بازرگانیە (أبو سفیان )بوو ...

ژمارەی پاسەوانانی کاروانەکە(٤٠)کەس بوون...پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا بڕواتە دەر بۆ دەست بەسەرا گرتنی ئەو کاروانە تا هەندێك ماڵ و سامانی زەوت کراویان دەست بکەوێتەوە، بەڵام(أبوسفیان) هەواڵی زانی کەموسڵمانان دەیانەوێت هێرش بکەنە سەرکاروانەکەی، بۆیە بە(عمرو)ی‌کوڕی (ضمضم)دا هەواڵی نارد بۆ قورەیش، ئەویش لوتی وشترەکەی بڕی‌و سەراپای لاشەی بەخوێن سواخ داو جلەکانی خۆی دڕاندو بەخێرایی بەرەو مەککەڕۆیشت و لەدەروازەی شاردا بەهاواری فریاکەوتنەوە خۆی کرد بەنێو کوچەو کۆڵانەکاندا سەرانی قورەیش لای(حرم)دا کۆبونەوەو (عمرو) ڕوداوەکەی بۆ گێڕانەوە، (أبوجهل) وتی: (والله) هەر ئەم شەو دەبێت دەربچین بۆیان... بەڵێ.. قورەیش بە(٩٥٠) کەسەوە هاتنەدەر(٢٠٠)کەسیان ئەسپ سواربوون و سەد وشتریشیان بۆ سەربڕین پێ بوو لە حاڵێکدا پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کاروانەکە هاتبووە دەر نەك بۆ جەنگ بە (٣١٣) کەس لە هاوەڵان تەنها (٧٠) وشتریان پێ بوو.



لەم کاتانەدا (أبوسفیان) ئاراستەی کاروانەکەی گۆڕی‌و توانی خۆی‌و کاروانەکەی لەدەستی موسڵمانان ڕزگار بکات، ئەوسا یەکێکی نارد تا هەواڵ بدات کەکاروانەکە لەمەترسی ڕزگاری بووە....بۆیە هەندێك لەسەرانی قورەیش ڕایان وابوو سوپاکە بگەڕێننەوەو جەنگ نەکەن بەڵام (ابو جهل) سوور بوو لەسەر ئەو جەنگەو وتی: هەر دەبێ بڕۆین وشترەکان سەربڕین و مەی بخۆینەوە هەتا عەرەب بزانێت قورەیش لە لوتکەی دەسەڵات و هێزی خۆیدایە .. پێغەمبەر(ﷺ) بەهاتنی قورەیشی زانی وەك لەپێشەوە باسکرا پەیمانێك لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ)، وە پشتیواناندا هەبوو کە وەك چۆن پارێزگاری لە ماڵ و منداڵیان دەکەن هەر بەو شێوەیە پارێزگاری لە پێغەمبەر(ﷺ) بکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خەڵکینە ڕاوێژتان پێ دەکەم ..مەبەستی لەوە بوو ڕای هاوەڵان بزانێت (أبوبکر) هەڵساو وتی: بەردەوام بە لەسەر ڕێگەی خۆت پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە.. پاشان جارێکی تر پرسیارەکەی دوو بارەکردەوە (عمر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ڕێگەی خۆت بەردەوام بە ئێمە لەگەڵتاین، پێغەمبەر(ﷺ) بەویشی فەرموو خوا پاداشتی خێرت بداتەوە ئەی (عمر) جارێکی تریش پێغەمبەر(ﷺ) پرسیارەکەی دوو بارەکردەوەو ئەی ویست ڕای پشتیوانان بزانێت. ئەوەبوو (مقداد)ی کوڕی (عمرو) کەلەکۆچ بەران بوو وتی: بڕۆ (یارسول الله)، (والله)ئێمە وەکو نەوەی (ئیسرائیل) نابین کە بە (موسی)یان ووت: بڕۆ خۆت و خواکەت بجەنگێن ئێمە لێرە دانیشتووین!! ، بەڵکو پێت دەڵێین: بڕۆ خۆت و خواکەت بجەنگن ئێمەش لەگەڵتاندا دەجەنگین !! ...

پێغەمبەر(ﷺ) بە(مقداد)یشی فەرموو خوا پاداشتی خێرت بداتەوە، ئەوسا پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جارێکی تر داخوازیەکەی دووبارەکردەوە، ئەم جارە (سعد



کوڕی معاذ) کە لەپشتیوانان بوو وتی: یارسول الله، دەڵێیْ مەبەستت ئێمەیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بەڵێ ئەی (سعد)،(سعد) کەگەورەی (ئەوس) بوو وتی: یا(رسول الله) ئێمە باوەڕمان بە بەڕێزت هێناو بڕوامان پێ کردیو پەیمان و وادەی خۆمانمان لەسەر گوێ گرتن و فەرمان بەرداری پێ دایت، کەواتە بەردەوام بە لەسەر مەبەستی خۆت، (والله یارسول الله) ئەگەر بڕۆیتە نێو قوڵایی دەریاوە لەگەڵتا دەڕۆینە ناویو یەك کەسمان دوا ناکەوێت، هەرچیەکیشت دەوێت لەماڵ و سامانمان بیبەو چیشمان بۆ دەهێڵیتەوە، ئارەزووی خۆتە، ئەوسامانەی دەی بەیت لامان خۆشترە لەوەی کەدەیهێڵیتەوە لەگەڵ کێدا ئاشتی دەکەیت بیکە، لەگەڵ کێشدا جەنگ بەرپا دەکەیت بیکە، لەگەڵ کێدا پەیمان دەبەستیت بیبەستە، پەیوەندی لەگەڵ کێدا دەکەیت ئەنجامی بدە، لەگەڵ کێدا پەیوەندی دەپچڕێنیت ویستی خۆتە (والله یارسول الله) دەمانبینیتەوە لەجەنگدا ڕاستگۆ دەبین لە بەیەکدادانەدا، بەئارام دەبین بەئومێدی خوا، بەهۆی ئێمەوە چاوت گەش دەبێتەوەو ئاسودەدەبێت پێغەمبەر(ﷺ) بەوەڵامەکەی سعد زۆر گەشایەوەو دڵخۆش بوو .

## دەست پێکردنی جەنگ :

پێش دەست پێکردنی جەنگ پێغەمبەر(ﷺ) (علی) کوڕی (أبو طالب)و (زبیر)ی کوڕی (عوام)ی نارد بۆ ئاگادار بوون لەقورەیش و زانینی ژمارەیان، کابرایەکیان گرت، کاری میراوی بۆ سوپاکە ئەنجام دەدا ...لێیان پرسی وتیان: تۆ لای (أبو سفیان)ی؟ وتی: نەخێر، ئەمانیش لێیان دا، هەتا ناچار بوو وتی: بەڵێ لای (ابوسفیان)م ، ئەوانیش هێنایان بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی: ئەوکاتە ڕاستی پێ وتن لێتاندا، بەڵام کەدرۆی کرد وازتان لێ هێنا!!



پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسی: ژمارەی قورەیش چەندە؟ کابرا وتی: نازانم، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: چەند سەردەبڕن؟ کابراکە وتی: نۆ تا دە ووشتر! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ژمارەیان لە نێوان( ٩٠٠تا ١٠٠٠ )کەس دان. پاشان کابرا وتی: هەموو سەرانی قورەیش هاتوون، ناوی ژمارەیەکی وتن، پێغەمبەر(ﷺ) سەیرێکی هاوەڵانی کرد بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ورەیان فەرمووی: الله اکبر قورەیش بەخۆیان و کەسایەتیەکانیانەوە هاتوون!! پاشان پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ (ابوبکر)دا گەشتێکی کرد تا لە نزیکەوە هەواڵی قورەیش بزانێت، پیاوێکی بەتەمەنی عەرەبیان بینی لێیان پرسی: سوپای قورەیش و سوپای (محمد) چۆن دەبینی کابرا وتی: ئێوە کێن؟ فەرمووی: ئەگەر پێمان بلێیت پێت دەلێین، پیاوەکە وتی: داش بە داش!! کابرا وتی: ئەو کەسەی کە هەواڵەکەی پێدام وتی: قورەیش فلانە ڕۆژ هاتوونەتە دەر ئەگەر وابێت ئەوا ئێستا لە( عدوة القصوی)ن، هەروەها لەشکری (محمد)یش ئێستا گەیشتۆتە (عدوةالدنیا)... پێغەمبەر(ﷺ)هەڵسا.. پیاوەکە وتی: ئێوە کێن؟ پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کردو فەرمووی: ئێمە لە ئاوین!! کابرا سەری سوڕما ئاخۆ هۆزێك هەبێت ناویان ئاوبێت و ئەم نەیبیستبێت!! ؟ پێغەمبەر(ﷺ) لە (عدوة الدنیا) لەبەرامبەر (عدوةالقصوی)دا بوو سوپایقورەیش لەبەرامبەریدا وەستابوو، گۆڕەپانێك لە نێوانیاندا بوو سروشتی ئەو زەویەی کە بێ باوەڕانی لەسەر بوو زۆر جیاواز بوو لەو زەویەی موسڵمانان لەسەری بوون هاوەڵگەران نغرۆی لیتەوقوڕاو بوون لەشەوی جەنگەکەدا بەهۆی باران بارینەوە بەڵام خاکی لای موسڵمانان بەو بارانە پتەو تربوو، لەلایەکی ترەوە خوای گەورە موسڵمانانی خستە حاڵەتی وەنەوزەوە هەتا چەند چرکەیەك بخەون و وزەیان تێ بێتەوەو پشوویەك بدەن تا ئامادەبن بۆ جەنگ کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە ئامادەکردنی سوپا بۆ

جەنگ شوێنێکی دیاریکرد بیرەکان دەکەوتنە نێوان خۆیان و بێ باوەڕانەوە، لەو کاتەدا (خەبابی) کوڕی (منذر) هات و وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا بوونمان لەم شوێنەدا خوای گەورە فەرمانی پێ داوی؟ یان جەنگەو نەخشەو پلانە؟!
پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جەنگ و نەخشەو پلانە، (خباب)وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەواتە ئەم شوێنەی بەڕێزتان دیاریتان کردووە باش نیە، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئەی ڕای تۆ چی‌یە؟ (خباب) وتی: من ڕام وایە بیرەکان پڕ بکەینەوەو یەك بیر بهێڵینەوە ئەو کاتە ئێمە لەو بیرە دەخۆینەوەو ئەوان بێ ئاو دەبن توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی ئێمەیان نابێت ئەو کاتە ئێمە بەهێزتر دەبین و ئەوان لەبەر ئاو دەجەنگێن لەگەڵمان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ڕاکەت پێکا بیرەکان پڕ بکەنەوە ...

کاتێك هەردوولا لەبەرامبەر یەکدا وەستان پێغەمبەر(ﷺ) پشتی بەنەخشەیەك بەست قوڕەیش لەوەو پێش نەخشەی وایان نەدیبوو، ئەوان لەسەر جەنگی پەلامار دان و پاشەکشە ڕاهاتبوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نەخشەکەی بەم جۆرە بوو: جەنگاوەران بەڕیزێك بووەستن و تیرهاوێژەکانیش لە پشتیانەوە بن، کاتێك هاوەڵگەران وبیستیان پێش بکەون، تیرهاوێژەکان تیربارانیان دەکەن و ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکوژن، ناچار دەبن بەپاشەکشەو، ئینجا ئەمانیش هێرشی کتوپڕیان دەکەنەسەرو دووچاری شکستیان دەکەن...
پێغەمبەر(ﷺ)لەبەردەم سوپای موسڵمانانندا وەستاو فەرمووی: هەڵسن بەرەو بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەویە، یەکێك لە هاوەڵان کەناوی (عمیری) کوڕی (حمام) بوو وتی: بەهەشت بەئەندازەی پانتایی ئاسمانەکان و زەویە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ ئەی (عمیر)، (عمیر) وتی: بەه، بەه

(یارسول الله) ئومێد ئەکەم ئەمڕۆ بیمە بەهەشتی، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: تۆ بەهەشتیت، لەوکاتەدا (عمیر) چەند دەنکە خورمایەك لەدەستیدا بوو، وتی: نێوانی من وبەهەشت ئەم دوو سێ دەنکە خورمایەی دەستمە!؟ بەڕاستی ژیانێکی دوورو درێژە بۆیە خورماکانی فڕێداو چووە نێو جەنگەکەوەو بوبە یەکەم شەهید...

جەنگەکە بەهاتنە دەرەوەی سیان لە قورەیش دەستی پێ کرد بۆ زۆرانبازی، (عتبة)و(شیبة)کوڕانی (ربیعة)،(ولید)ی‌کوڕی(عتبة)، لەبەرامبەریاندا سێ کەس لەپشتیوانان هاتنەدەر (عتبة) پێی وتن ئێوە کێن وتیان ئێمە لە پشتیوانانین، (عتبة) وتی هاوشانی بەڕێزن بەڵام ئێمە هاوشانەکانی خۆمانمان دەوێت بۆیە هەرسێکیان گەڕانەوەو پێغەمبەر(ﷺ) (علی )ئامۆزای و(حمزە)ی مامی‌و(ابو عبیدەی کوڕی حارث)ی نارد بۆیان ..

شەڕەشمشێر دەستی پێکرد (علی) (ولید)ی‌کوشت، (حمزە)یش (شیبة)ی کوشت بەڵام (أبو عبیدە) لەلایەن (عتبة)وە شمشێرێك بەرقاچی کەوت و قرتا، بۆیە (علی)و(حمزە) هێرشیان کردە سەر (عتبة)و ئەویشیان لەناودا، لەکاتی سەرەمەرگدا (ابو عبیدة ) فەرمووی یارسول الله، بەئەرکی سەرشانی خۆم هەستام؟! پێغەمبەر(ﷺ)دەستەکانی بەرزکردەوەو فەرمووی: خوایە تۆبە شایەت بە کە (أبو عبیدة) بە وەفابوو... دوای ئەوە یەکسەر گیانی سپارد خوا لێی ڕازی بێت. ئینجا هاوەڵگەران دەستیان کرد بەهێرش کردن، بەڵام لەناکاو ئەو جەنگاوەرانەی لەبەرامبەریان وەستابوون دیار نەمان و تیرهاوێژەکان لێیان هاتنە پێش و تیربارانیان کردن و کۆمەڵێك لە ناودارانی قورەیش کوژران، (عبدالرحمن)ی کوڕی (عەوف) سەرکردایەتی لای ڕاستی سوپاکەی دەکرد، دوو مێرد منداڵ لە (عبدالرحمن) هاتنە پێش، تەمەنیان ١٤ ساڵ و ١٥ ساڵ بوو،



پرسیاری (ابو جهل)یان کرد ئەمیش لێی پرسین چیتان داوە لە (ابو جهل) وتیان: بیستومانە تانەو تەشەرو ئازاری زۆری پێغەمبەری داوە(ﷺ) لەبەر ئەوە ئەم فرسەتە لە دەست نادەین و دەبێ تۆڵەی لێ بکەینەوە !! (عبدالرحمن)یش ئاماژەی بۆ (أبو جهل)کرد ئەوانیش وەك دوو تیری لەکەوان دەرچوو بەرەو لای چوون، یەکێکیان ناوی (معاذ) بوو ئەوی تریان (معوذ) (معاذ)گەورەتر بوو بە(معوذ)ی وت تۆ بەشمشێرەکەت قاچی ئەسپەکەی بپەڕێنە منیش دەیکوژم، ئەوەی نیازیان بوو بەدیان هێنا (معوذ) بەشمشێرەکەی قاچی ئەسپەکەی قرتاندو(ابو جهل) لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە (معاذ)یش هێرشی بۆ هێناو کوشتی هەردووکیان پێش برکێیان بوو بۆ گەیاندنی ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش (عبدالله)ی کوڕی (مسعود)ی نارد هەتا لە هەواڵەکە دڵنیا بێت، سەیری کرد لە دواهەناسەدایە...

پێغەمبەر(ﷺ) لەناوەڕاستی جەنگەکەدا وەستاو بەدەنگی بەرز هاواری کرد هەر کەسێ (أبو البختری) بینی نەیکوژێت، وتیان بۆ (یارسول الله)؟ فەرمووی وەك وەفایەك کەلە ڕۆژی بڕیارنامەی گەمارۆدا هەڵوێستی جوان بوو، هاوەڵێك لەنزیکیەوە بوو بەڵام هێرشی نەکردەسەر، ئەویش پێی سەیربوو بۆ پەلامارم نادەیت؟ هاوەڵەکە وتی: پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی پێکردووین نەت کوژین، (ابوالبختری) پرسی بۆچی؟! هاوەڵەکەوتی: وەك وەفایەك بۆ ئەو ڕۆژەی کە بڕیاری گەمارۆکەی شیوی (ابوطالب) تان بەدیواری کەعبەوە دڕاند، (ابوبختری) وتی: ئەی ئەگەر من پەلامارت بدەم! هاوەڵەکە وتی لەدەستت هەڵدێم و گوێ ڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەم، کەچی ئەو کەوتە ڕاونانی هەتا وای لێ هات ناچار بوو بەرگری لە خۆی بکات و بیکوژێت ئەوسا بەگریانەوە چوو بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)وتی واللە نەمویست بیکوژم بەڵام ئەگەر نەم کوشتایە



دەیکوشتم ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی نیگەران مەبە ، ئێمە ویستمان ئەمەکدار بین.

**دابەزینی فریشتەکان :**

لەوساتانەدا کەجەنگ گەرم بوو پێغەمبەر(ﷺ)کەوتە دەست بەرزکردنەوەو نزاکردن بە جۆرێك سپایی بن باڵی دەرکەوت و لەخوای گەورە دەپاڕایەوەو دەیفەرموو خوایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە لەناو بچێت ئیتر تۆ لەزەویدا ناپەرسترێیت لەوکاتەدا (أبوبکر) لەتەنیشتیەوە بوو فەرمووی: (یارسول الله).. هێور بەرەوە ... بەڵام ئەو لەسەر ئەو حاڵەتە مایەوە هەتا (جبریل)ی بینی و فەرمووی ..الله أکبر ئەوە (جبریل)ە لەگەڵ کۆمەڵێك لەفریشتەکاندا... ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)مشتی وردە بەردی هەڵگرت ڕوو بەکافران فڕێداو فەرمووی: ئەوە شوێنی کوشتنی (ابوجهل)ە ئەوە شوێنی (عتبة)یە.

سەرەنجام لەم جەنگەدا ١٤هاوەڵ شەهید بوون هەموویان لە پشتیوانان بوون جگە لە (أبو عبیدة)ی کوڕی (حارثة) کەلە کۆچبەران بوو.

**جەنگی ئوحود :**

دوای ئەوەی قوڕەیش هەستیان کرد بەوەی دەسەڵات و پێشەوایەتیان لەنێوان دورگەی (عرب)دا شکستی هێناوە بڕیاریاندا هێرش بکەنەوە سەر مەدینەو بیسەلمێنن کەشکستیان نەخواردوە، هەروەها تۆڵەی کوژراوەکانی جەنگی بەدریش بکەنەوە.

بۆ ئەم مەبەستە نزیکەی سێ هەزار جەنگاوەریان ئامادەکرد، هەواڵ بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت، لەویش موسڵمانانی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێ کردن،کە ئایا لە نێو مەدینەدا بمێنینەوەو لەنێو کۆچ و کۆڵانەکاندا بجەنگێین، ئافرەتانیش



بەشداری لەو جەنگەدا بکەن و لەسەر بانەکانەوە بەردبارانیان بکەن، یاخود بچینە دەرەوە ی شار؟!

زۆرینەی هاوەڵان ڕایان لەسەر چونە دەرەوە بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕەزامەندی نواند هەرچەندە خۆی ڕای لەسەر جەنگی ناوشار بوو، بەڵام ویستی فێرمان بکات کەڕێز لە ئاکامەکانی ڕاوێژ بگرین و پێشەنگیش بێت بۆ هەموو سەرکردەیەکی دوای خۆی... جا دواتر هاوەڵان هەستیان کرد ڕای پێغەمبەر لەسەر مانەوەی ناوشارە، بۆیە وتیان: دەترسین ئێمە بەڕێزتانمان ناچار کردبێت (یارسول الله) کەچی پێغەمبەر(ﷺ) بەو قسەیە تورە بوو چونکە نەیدەویست بڕیارێك بەڕاوێژ دراوە هەڵبوەشێتەوە، بۆیە فەرمووی: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە کەبەرگی جەنگی پۆشی دای بنێت هەتا خوای گەورە خۆی بارودۆخەکە یەکلایی دەکاتەوە.

**یەکەم جموجوڵی دووڕووەکان لە نێوان کۆمەڵگەی ئیسلامیدا :**

سوپای موسڵمانان لەشار دەچوون ژمارەیان هەزار جەنگاوەر دەبوو کاتێك بەرەو گۆڕەپانی جەنگ دەڕۆیشتن سەرۆکی دووڕەووەکان (عبدالله)ی کوڕی(أبی) هەڵسا بە سەرکردایەتی کردنی بزاوتێکی سەرپێچی‌کردن بەو بیانووەی کە پێغەمبەر(ﷺ)ڕای ئەوی وەرنەگرتووە. مەبەستی مانەوە بوو لەنێو مەدینەدا.. ئەیوت سەرپێچی منی کردو گوێڕایەڵی منداڵ و هەرزەکارەکانی کرد، بۆیە بەرەو مەدینە گەڕانەوە نزیکەی سێسەد کەسیشی لەگەڵدا گەڕایەوە، کەدەکاتە سێیەکی سوپاکە، بێگومان ئەو حاڵەتە کارکردی لەسەر هەندێك لە هاوەڵان هەبوو.



ئیتر ئەوەبوو خوای گەورە ئەو(٧٠٠ )کەسەی دڵقایم کردو پێشڕەوییان کرد تا گەیشتنە (أحد) ..

**۞ پێغەمبەر(ﷺ) نەخشەی خۆی دەسەپێنێت بەسەر هاوەڵگەراندا :**

سوپای موسڵمانان گەیشتە (أحد)، پێغەمبەر(ﷺ)کەوتە ڕێکخستنی سوپاکە بەشێوەیەك کێوی (أحد) دەکەوتە پشتی موسڵمانانەوە تا هاوەڵگەران نەتوانن پشتیان لێ بگرن، بەتایبەت کە (٥٠) تیرهاوێژی لەسەر گردێك دانا بۆ ئەو مەبەستە..

(مصعب)ی کوڕی (عمیر) ئاڵا هەڵگری سوپا بوو (حمزە)ش سەرکردایەتی کردەوە جەنگیەکانی دەکرد، هاوکارەکانیشی (علی)کوڕی(أبوطالب)و(زبیر)ی کوڕی(عوام)بوون، پێش دەست پێکردنی جەنگەکە پێغەمبەر(ﷺ)ڕووی کردە تیرهاوێژەکانی سەر گردەکەو پێی فەرموون: ئەگەر ئێمەتان بینی سەرکەوتنمان بەدەست هێناوەو دەستکەوتەکانی جەنگ کۆدەکەینەوە مەیەنە خوارەوە لە شوێنی خۆتان مەجولێن، خۆ ئەگەر ئێمەتان بەشکاوی بینیو داڵ سەرمانی دەخوارد هەرشوێنی خۆتان چۆڵ مەکەن..پێش دەستپێکردنی جەنگەکە پێغەمبەر(ﷺ)کەوتە بەرزکردنەوەی ورەی هاوەڵان وشمشێرەکەی بەرزکردەوەو فەرمووی: کێ ئەم شمشێرەم دەبات بۆ خۆی، هەریەك لە هاوەڵان وتی: من یارسول الله، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: کێ بەدەستی سوك وئاسانە؟! (أبودوجانة) شمشێرەکەی هەڵگرت و پارچەیەك پەڕۆی سوری بەناوچەوانیەوە بەست و لەبەردەم سوپادا وەستاو بەکەیف و شانازیەوە دەڕڕۆیشت و شیعرێکی دەوت کەدیار بوو تامەزرۆی شەهیدیە.



جەنگەکە دەستی پێکرد قورەیش لەناکاو بۆیان دەرکەوت موسڵمانان بەسەر مەیدانی جەنگەکەدا زاڵن و تیرهاوێژەکان لە شوێنی خۆیاندان، هەربۆیە زۆر بەخێرایی ئاڵاکانیان دەکەوتن تا ژمارەیان بووە(٩) ئاڵا هەمووشیان لە هۆزی (بنی عبدالدار) بوون، موسڵمانان زۆر بەئاسانی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا وبێ باوەڕان زۆر بەخراپی تێکشکان، بە جۆرێك لە نێو مەیدانی جەنگدا ڕایان کرد، کاتێك تیرهاوێژەکان بینیان سەرکەوتن بەدەست دەهات ، کەوتنە مقۆ مقۆی دابەزین لە شوێنەکانیان ، (عبداللە)ی کوڕی(جبیر) فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای بیرهێنانەوە بەڵام گوێیان بەقسەکانی نەداو ٤٠ کەسیان بەرزاییەکەیان جێ هێشت و دابەزینە ناو مەیدانی جەنگەکە تەنها (عبداللە)ی کوڕی(جبیر)و ١٠ کەسی تر مانەوە ...

(خالد)ی کوڕی(ولید) بەم حاڵەتەی زانی بۆیە لەگەڵ نزیکەی ٣٠٠ سواردا بە خێرایی بەبناری بەرزاییەکەدا هەڵگەڕان و پشتیان لە موسڵمانان گرت، بەمەش موسڵمانان زۆر شپرزە بوون پەلاماری (مصعب) ئاڵا هەڵگری موسڵمانان دراو شەهیدکرا و ئاڵاکە کەوت، پاشان هاواری کرد (محمد)م کوشت... موسڵمانان لەدواوەو لەپێشەوە گەمارۆ دران، دەنگوباسی شەهیدکردنی پێغەمبەریش(ﷺ).. ورەی ڕوخاندن، سوپاکە شپرزەبوو تەنها ٢٠ کەس لە هاوەڵان بەدەوری پێغەمبەردا(ﷺ)مانەوە یەکێکیان (نسیبة)ی کچی(کعب) بوو، هاوەڵگەران هەموو هەوڵێکی خۆیان خستەکار بۆ لەناوبردنی ئەو تاقمەی کە دەوری پێغەمبەریان دابوو، دڕندانە تیربارانیان دەکردن، لەوکاتەدا (ابودجانة) باوەشی کردبوو بە پێغەمبەردا تا تیری بەرنەکەوێت، بەڵام تیرێك چەقی بەپشتی دا کەچی هەرپێغەمبەری بەرنەدا ئینجا (سعد)ی کوڕی(أبو

وقاص) هات و کەوتە تیربارانی ئەو دڕندانە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (سعد)بیهاوێژە دایك و باوکم بەقوربانت بێت.. بەم بەرگریەی (سعد) هاوەڵگەران کەمێك کشانەوە پاشان (طلحة)ی کوڕی (عبیدالله) وتی (یارسول الله)سەرت دانەوێنە باتیرێکت بەر نەکەوێت پاش کەمێك تیرێکی بینی بەرەو ڕووی پێغەمبەر(ﷺ) هات خێرا دەستی خستەبەری یەکسەر تیرەکەدەستی کونا وەدەرکرد، بەڵام هەرکۆڵی نەدا .

یەکێکی تر لەوانەی بەرگرییان لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد (یزید)ی کوڕی(سکن)بوو، (یزید) لەگەڵ (١٠)کەس لەگەنجانی پشتیوانان ، دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) تەواو ماندوو بوو فەرمووی: کێ لەمنیان دوور دەخاتەوە بەهەشت بۆ ئەوە (یزید) ووتی: ئەوانت لێ دور بخەینەوە بەهەشتمان دەست دەکەوێت؟! فەرمووی: بەڵێ ..

ئەوەبوو، یەکەمیان چووە پێشەوەو شەهید کرا، پاشان دووەم کەس و سێ یەم و چوارەم لەبەردەمی پێغەمبەردا دەچوونە پێشەوەو شەهید دەکران کۆتا کەسیان (یزید)ی کوڕی (سکن) بوو سەراپای لاشەی خوێنی پیادا دەهاتە خوار بەهۆی زۆری برینەکانیەوە، کاتێك کەوتە سەرزەوی‌و دەم و چاوی چەقی بەخۆڵدا، پێغەمبەر(ﷺ) سەری لەسەر زەویەکە بەرزکردەوەو کەوتە سڕینی دەم وچاوی هەتا گیانی سپارد، پێغەمبەر(ﷺ) دەستەکانی بەرزکردەوەو فەرمووی: خوایە تۆ بەشایەت بە کەمن لە (یزید)ی کوڕی(سکن) ڕازیم ..

(ابی)کوڕی(خلف) کافرێکی زۆر سەرسەخت و دڵڕەش بوو ئەوسا لەمەککە کە پێغەمبەری دەبینی(ﷺ)دەیووت: (محمد) ئەزانی بۆچی ئەم ئەسپە قەڵەو دەکەم؟!! قەڵەوی دەکەم هەتا بەویستی خوا من تۆ بکوژم!! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بەویستی خوا من تۆ دەکوژم.. لەم جەنگەدا



(أبی)کوڕی(خلف) هات، بەرگی ئاسنینی پۆشیبوو.. لەپێغەمبەر(ﷺ)نزیك بوەوە، (طلحة)ی کوڕی(عبیدالله) وتی: ئەوە ئەسپ سوارێك هات بۆمان و دەڵێت کوا (محمد)

پێغەمبەر(ﷺ)زانی کە(ابی)کوڕی)(خلف)ە بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)ڕمێکی هەڵگرت و تێی گرت و بەئاستەم برینداری کرد، کەچی (ابی) تۆقی وهاوای دەکرد (محمد)کوشتمی، وەکو وشتر دەیبۆڕاندو بەرەو کێوە کە سەردەکەوت هەتا لەشوێنێکی سەرکێوەکەدا کەوت و مرد، ئینجا بکوژەکەی (مصعب)هاتە پێشەوە بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) (ام عمارة) شمشێرەکەی دەستی بەرز کردەوەو لەبەردەمیدا وەستاو پشتی پێغەمبەری خوای گرت کە لەوکاتەدا لەگەڵ یەکێکی تردا دەجەنگا، کابرا زۆر بە (ام عمارة ) پەست بوو ویستی لەدەستی ڕزگار بێت، چونکە لەنێوان عەرەبدا نەنگییە ئافرەت لەجەنگدا بکوژرێت بۆیە کابرا هیچی بۆ نەمایەوەو ماڵی بەدەستیداو شمشێرەکەی لەدەست خست، بەڵام هەر نەیهێشت خۆی بگەیەنێتە پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا شمشێرێکی تریدا لەشانیو شکاندی بەو حاڵەیشەوە هەر نەیهێشت خۆی بگەیەنێتە پێغەمبەر(ﷺ) پاشان بەشمشێرەکەی ئەوەندەیدا بەشان و ملیدا خوێن بەلاشەیدا فوارەی کردو لە شوێنی خۆیدا کەوت بەزەویدا کاتێك (حبیب)ی کوڕی(زید)دایکی بینی بەوشێوەیە، هات ڕزگاری بکات. دایکی وتی: واز لەمن بێنە بڕۆ فریای پێغەمبەری خوا بکەوە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) (ام عمارة)ی بینی ئاوای لێ هاتووە فەرمووی : کێ ئەتوانێ وەکو تۆ بەرگە بگرێت، (ام عمارة ) وتی: چۆن بەرگە ناگرم (یارسول الله) بەڵام داوایەکم لێت هەیە



ئەویش هاوەڵیتە لەبەهەشتدا پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: تەنها تۆنا، بەڵکو هەمووتان هاوەڵم دەبم لەبەهەشتا ..

## ۞ خوایە ڕێنموویی گەلەکەم بکە چونکە ئەوان نازانن !!

(أنس)ی کوڕی(نظر) جەنگی بەدری نەبینیبوو بۆیە بڕیاریدا هەر جەنگێکی تر ڕووبدات ئەبێت بەشداری بکات، کاتێك جەنگی (احد) ڕویدا (انس) لەسەفەردا بوو کاتێك گەڕایەوە بۆ مەدینە سەیری کرد هاوەڵان لەجەنگەکە گەڕاونەتەوەو دەنگ و باس وایە کە پێغەمبەر(ﷺ) شەهید کراوە!! بۆیە ڕوی تێکردن و وتی: جا دوای پێغەمبەر(ﷺ) ژیانتان بۆچی‌یە ؟! هەڵسن بمرن لە پێناوی ئەوەی ئەو لە پێناویدا شەهید بوو، ئەوسا سوپاکە هەمووی گەڕایەوە دەوری پێغەمبەر(ﷺ)..ئەویش کەوتە شوێنگۆڕکێ، یەکێك لە کافران کەناوی (ابو عامر)ی فاسق بوو، چاڵێکی هەڵکەند هەتا پێغەمبەری(ﷺ) تێبکەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) بەڕویدا تێی کەوت و دانی شکاو دەمی موبارەکی پڕبوو لە خوێن لەوکاتەداتەدا کافرێك شمشێرێکی‌دا بەسەرکڵاوە ئاسنەکەی سەری پێغەمبەردا(ﷺ) سەریشی شکاند.. هاوەڵان هاتن پارچەئاسن لەڕومەتی دەربکەن (أبو عبيدة)کوڕی (جراح) هات و سوێندی خوارد کەدەبێ خۆی ئاسنەکە لەڕوومەتی موبارەکی دەربهێنێت، ئەوەبوو بەدانی خۆی پارچەئاسنەکەی دەرهێناو بوبەهۆی شکاندنی دانی (خوالێی ڕازی بێت ) ..

خوێن بە ڕووخساری پێغەمبەردا(ﷺ) هاتە خوارەوەو دەم و چاوی داپۆشی (عمر) فەرموی: یارسول الله بۆ دوعایان لێ‌ناکەیت پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: نەهاتووم نزای شەڕ لەخەڵکی بکەم بەڵکو هاتووم ڕەحمەت و ڕێنیشاندەرم، پاش ماوەیەك دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، وایان



زانی دوعایان لێ دەکات بەڵام فەرمووی (اللهم اهدِ قومي فأنهم لايعلمون).. واتە: خوایە هیدایەتی قەومەکەم بدە چونکە ئەمانە نەزان و نەفامن.

## ☾ چەند نمونەیەک لەشەهیدانی ئوحود ...

وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا (أنس)ی کوڕی(نضر) بەهۆی سەفەرەوە جەنگی بەدری نەبینی، بۆیە پەیمانی بەخوای خۆیدا کە بەشداریی هەر جەنگێکی تر بکات کە بەرپا ببێت، کاتێك جەنگی (احد) ڕویدا ئەوجارەیش (انس) لەناو سەفەردا بوو، کاتێك گەڕایەوە هاوەڵانی بینی مات و نیگەرانن، وایان زانیوە پێغەمبەری(ﷺ)خوا شەهید بووە .. ورەی بەرزکردنەوەو سەراپای سوپاکەی لەگەڵ خۆیدا بەرەو (احد) بردەوە، بۆ جەنگی تۆڵەو دەیووت ((بەخوای (نضر) بۆنی بەهەشت دەکەم )) ئەوسا جەنگا هەتا شەهید کرا ..

*** (حنظلة) ( شۆردراوی فریشتەکان ) :**

(حنظلة ) لەیەکەم ڕۆژی زاوایدا بوو، کاتێك گوێی لەبانگەوازی (جهاد) بوو دەیووت((ئەی ئەسپ سوارانی خوا هیمەت بکەن)) یەکسەر لەناو پێخەفی زاوایەتیدا هەڵساو فریای خۆشۆردن نەکەوت و بەرەو جەنگەکە بەڕێکەوت و شەهیدکرا، پێغەمبەر(ﷺ) سەری سوڕما لەوەی پۆلێك لەفریشتە لاشەکەی دەشۆن ..

*** ( عمرو ) کوڕی (جموح) :**

(عمرو) پیاوێکی شەل و کەم ئەندام بوو خوای گەورە مۆڵەتی شەل و کەمئەندامانی داوە کەبەشداری جەنگ نەکەن، (عمرو) چوار کوڕی هەبوو، وتیان: بابە ، تۆ مەیە بۆ جەنگ ئێمە لە جیاتی تۆ دەچین، (عمرو) توڕەبوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای خۆی کرد، ئەویش فەرمووی: بەڵام تۆ



لەسەرت نیە، (عمرو) وتی (یارسول الله) دەمەوێت بەم قاچە شەلانەوە بچمە بەهەشتەوە!! پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کردو بەکورەکانی فەرمووی: وازی لێبهێنن.. ئەوسا ڕۆیشت بۆ جەنگەکە کاتێك ئاوڕی دایەوە لەمەدینە وتی: خوایە مەم گێڕەوە بۆناوی ئەوە بوو ئیتر شەهید بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (عمرو) کوڕی(جموح)م بینی بەقاچە شەلەکانیەوە خۆی گەیاندبووە بەهەشت ...

*** ( عبدالله ای کوڕی حرام ) :**

(عبدالله) باوکی نۆکچ و یەك کوڕ بوو کەناوی (جابر ) بوو ئەوەبوو لەنێو خۆیاندا تیرو پشکێکیان کرد بۆ (عبدالله) دەرچوو (جابر) گریاو لەباوکی پاڕایەوە ئەم جارە با نۆرەی من بێت کەچی (عبدالله) ووتی: مەسەلەکە بەهەشتە، هەرشتێکی تر بوایە پێم دەدایت، ئەوەبوو ئەویش شەهید بوو. کاتێك جابر هات باوکی ببینێت هاوەڵان ڕێگەیان نەدا لەبەرئەوەی کافرەکان لاشەیان ئەتك کردبوو، بەڵام دواتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێداو فەرمووی: مژدەت لێبێت جابر خوای گەورە فەرمایشتی لەگەڵ کەسدا بێ پەردەنەکردووە، بەڵام لەناو بەهەشتدا بەبێ پەردە قسەی لەگەڵ باوکتا کرد تا ئێستاش فریشتەکان سێبەریان بۆ کردووە. دوای ئەوەی (عبدالله) چووە نێو بەهەشت، خوای گەورە پێی فەرموو: ئەی بەندەکەم چی داوا دەکەیت، وتی: بگەڕێنمەوە بۆ دنیا لەپێناوتا بجەنگمەوەو شەهید ببمەوە، خوای گەورەش فەرموویەتی: من بڕیارمداوە کە ناگەڕێتەوە بۆ دنیا، بۆیە (عبدالله) داوای لە خوای باڵادەست کرد، بەبرا کانم ڕابگەیەنە ئەوەی من تیایدا دەژیم بەختەوەریەکی بێ وێنەیە بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانەکرد﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ



رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ* فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾(آل عمران /١٦٩-١٧٠ )

واتە:هەرگیز وامەزانن و وادەمەنێن ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون وکوژراون، مردوون، نەخێر وانیە،بەڵكو ئەوانە زیندوون، لای پەروردگاریان لەرِزق ورِۆزی هەمەجۆر بەهرەوەرن* زۆر دڵخۆش وشادمانن بەو بەخشش وزیادە فەزڵەی کەخوا پێی بەخشیون، مژدەش دەدەن بەوانەی هێشتا بەوانەی بەوان نەگەیشتوون کەبێگومان هیچ ترس و بیمێکیان لەسەرنی‌یە، هیچ غەم وپەژارەیەکتان بۆ پێش نایەت.

### * ( عبدالله )ی‌کوڕی( جحش ) :

(عبدالله) لەگەڵ هاوڕێیەکیدا قسەی دەکرد، هاوڕێکەی وتی: ئومێد دەکەم سبەینێ لەگەڵ کافرێکدا ڕووبەڕووببمەوەو بجەنگێم هەتا دەیکوژم، (عبدالله)یش وتی: منیش ئومێد دەکەم سبەینێ بەکافرێکی دڕ بگەم و بجەنگم تا دەیکوژم، پاشان بەیەکێکی تر بگەم و لەگەڵیا بکەومە جەنگەوەو دوایی بم کوژێت و ئینجا سکم هەڵدڕێت و لوت و گوێچکەکانم ببڕێت، بەو حاڵەوە لەڕۆژی قیامەتدا بگەمەوە بە خوای خۆم، ئەویش بفەرموێت: بۆچی وات لێ‌هاتووە؟! منیش بڵێم: خوایە گیان لە پێناوی تۆدا.. ئەوەبوو لەنێو گۆڕەپانی جەنگەکەدا بەشەهیدی بینیان، هەردوو گوێچکەیو لووتی بڕابوو لە تەنیشتیشیەوە کافرێك کەوتبوو..

### * ( سعد )ی کوڕی ( ربیع) :

دوای ئەوەی (سعد)ی کوڕی(ربیع) لەجەنگەکەدا برینداربوو لەدوا ساتەکانی مەرگیدا، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پرسی، ئەویش وتی: بە پێغەمبەر(ﷺ) بڵێن ئەوەی خوای خۆم وادەی پێ‌دام وەرم گرت، سڵاوم بە

پێغەمبەری خوا بگەیەنن و پێی بڵێن خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە، سڵاوم بە پشتیوانان بگەیەنن و پێیان بڵێن بیانوتان بەدەستەوە نیە ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) شتێکی بەسەر بێت!!

### * ( حمزە)ی کوڕی ( عبدالمطلب) شێری ئیسلام :

کاتێك(حمزە) هەستی کرد کە گۆڕەپانی جەنگەکە بەرەو ناهەمواری دەچێت، لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا بەرەوگردی تیر هاوێژەکان ڕۆیشت تادەست بگرنەوە بەسەر ئەو شوێنە ستراتیژیەدا، لەوکاتەدا ژمارەیەك لەکافرانی لەناوبرد بەڵام (وحشی) بەدوای فرسەتێکدا دەگەڕا هەتا بیکوژێت، ئەوەبوو ئەو فرسەتەی دەست کەوت ڕمێکی گرتە برپرەی پشتیو لەسنگیەوە دەرچوو .. (وحشی) بۆ جەنگ نەهاتبوو بەڵکو (هند)ی کچی(عتبة) بۆکوشتنی (حمزە) ناردبووی.. کاتێك (هند) زانی (وحشی)(حمزە)ی شەهید کردووە هاتە سەر لاشەکەیو بەخەنجەر سکی هەڵدڕیو جگەری دەرهێناو دەیکرۆشت !!

### ☪ کۆتایی جەنگ :

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)ئاکامی جەنگەکەی بینی هاوەڵانی بانگ کرد بۆ هەڵگەڕان بەچیای (أحد)دا بەوشێوەیە جەنگەکە سەرەتاکەی سەرکەوتنی موسڵمانان بوو، بەڵام دوایی ئەوەی زۆربەی تیرهاوێژەکان سەرپێچی فەرمانەکەی پێغەمبەری خوایان کرد سەرکەوتنەکە گۆڕا بەشکست ...

جا ئەگەر سەرپێچی ٤٠کەس لەموسڵمانان ببێتە هۆی شکست، ئەی ئەمڕۆ چەندەها ملیۆن بەشەوو بەڕۆژ سەرپێچی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەکەن چۆن نابنە هۆی شکست، ئەوانە کات بەفیرۆ دەدەن، ژیان لەحەرامدا دەگوزەرێنن. پەنا دەگرین بەخوای گەورە لەسەرپێچیکردن.. کەس واگومان



نەبات کەدورە لەبەرپرسیاریەتی هەمووومان بەرپرسیارین لەم ئاکامەی کە ئەمڕۆ ئەم ئوممەتەی تێکەوتووە، بۆیە دەبێت پابەندبوونی خۆمان بەفەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەوە بسەلمێنین هەتا شایستەی سەرکەوتن و هەلّسانەوە بین.



**● ئاستەنگەکانی سەر ڕێگای نیشتمانی نوێ :**

ئەوپرسیارەی کەدەبێت بکرێت ئەوەیە ئایا ئەم جەنگە شکست بوو بۆ موسڵمانان؟ یان بەچی دەدرێتە قەڵەم ؟

بێگومان لەبواری سەربازیدا، بەشکست هەژمار دەکرێت، بەڵام لەڕووی مەعنەوی‌یەوە پێی ناوترێ شکست، چونکە نە پێغەمبەر(ﷺ) نەباوەڕدارانیش هەستیان بە شکست نەدەکرد، یەکەم لەبەرئەوەی کە چەندەها ئایەت نازڵ بوو کەلەهۆی شکستەکە دەدواو دڵدانەوەی باوەڕدارانی دەدایەوە.

دووەمیش کاتێك کەچوونە شوێنی مزگەوتی (المستراح )و نوێژی عەسریان کردو تانوێژی بەیانی مانەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: ئەوەی باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە هەر ئێستا من دەڕۆم بۆ سەر قورەیش تەنها بەشدارانی دوێنێ شوێنم بکەون!!

**جەنگی (حمراء الأسد) :**

پێغەمبەر(ﷺ) بەو بڕیارەی ورەی موسڵمانانی بەرزکردەوە، هەروەها دەیزانی کە قورەیش٨میل دوورن و سەربازەکانیان ماندوون، بۆیە سەرکەوتن بەویستی خوا مسۆگەر دەبێت .

ئەوکاتەی کە گەیشتنە (حمراء الأسد) کە ٨میل لە شوێنی حەوانەوەکەیان دوور بوو، (أبو سفیان ) کەسێکی نارد بۆ ترساندنی موسڵمانان تابڵێت: ئەی(محمد) چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە، قورەیش بەرگی پڵنگیان لەبەرکردووەو خۆیان ئامادەکردوەتەوە بۆ جەنگ لەدژتان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کرد لەبەردەم هاوەڵاندا بەدەنگی بەرز دوبارەی بکاتەوە، دوای ئەوەی دوبارەی کردەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردن بەیەك دەنگ بڵێن (حسبنا الله ونعم



الوكیل)، هاوەڵانیش وتیانەوە، لەكاتەدا خوای گەورە چەند ئایەتێكی نازڵ كرد كە ئەو دەقەشی تێدابوو .. ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (ال عمران / ١٧٣)

كابرا ئەم ڕووداوەی بۆ (أبو سفیان ) گێڕایەوە، دیارە كە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی وەك جەنگێكی دەروونی لەبەرامبەر قوڕەیشدا ئەنجامدا، ئینجا هاوەڵێكی نارد بۆلای (أبوسفیان) ناوی (معبد)ی كوڕی(معبد) بوو نەیاندەناسی وتی: موسڵمانان زۆر بەخێرایی بەرەو لاتان دێن چەند بەرامبەری دوێنی زیاتریان كۆكردوەتەوە!!

(أبوسفیان) وتی: (واللە) ڕۆیشتنمان بە چاك دەزانم ئەمەش لەشوێنی (حمراء الأسد)دابوو دوابەدوای جەنگی (أحد).

### ☾ گیانبازێك لە قوتابخانەی پێغەمبەر(ﷺ) :

پیلانەكان تا دەهات لەسەر پێغەمبەری خوا كۆدەبونەوە (خالد)ی كوڕی (سفیان) كەوتە كۆكردنەوەی هۆزەكانی باكوری مەدینە وهانیدەدان بۆ داگیركردنی شارەكە، هەر كەسوپاكە نزیك بوەوە لەدەروازەی شار، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی بە(عبداللە)ی كوڕی (أنیس )دا خۆی بخاتە ڕیزی سوپاكەیانەوەو (خالد) ی كوڕی (سفیان) بكوژێت، ئەوەبوو (عبداللە) ڕیزی سوپاكەی بڕیو خۆی ناساند بە (خالد)و ئەویش پێشوازی لێ كرد، ئەوسا لەناكاو هەڵمەتی بردە سەرو توانی بیكوژێت. دوای ئەوەی (عبداللە) (خالد)ی كوشت سێ شەو بە كێوەكانەوە مایەوە خواردنی گەڵای داربوو، ئیتر سوپاكەیان پەرتەوازەبوو و(عبداللە)ش بەسەربەرزی گەڕایەوە مەدینە، لەوكاتەدا كە خەریك بوو لەشار نزیك دەبوەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەدورەوە بینی پێی فەرموو: شەوی تاریكت ڕوناك

کردەوە، عبداللە وتی ئەی پێغەمبەری خوا نەجاتم دا!! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللە اکبر )، ئینجا پێی فەرموو: پاداشتێکی باشت دەدەمەوە، ڕۆیشتە ژوورەوەو گۆچانەکەی هێناو بەخشی بە (عبداللە )و فەرمووی: ئەمە بگرەو لە قیامەتدا بمدەرەوە، چونکە بەهۆیەوە دەچیتە بەهەشتەوە، (عبداللە)ی کوڕی(أنیس) دەڵێت: سوێند بەخوا هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەو گۆچانە خۆشحاڵی نەکردووم بۆیە وەسیتی کرد گۆچانەکەی لەگەڵ خۆیا بنێژن.

بەڵێ قەیرانەکان لەساڵی چوارەمدا زۆربوون و تەواو بارودۆخەکە ناهەموار بوو، هۆزێك لەهۆزە نزیکەکانی دەوری مەدینە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، داوایان لێ کرد ئیسلامیان فێر بکات، پێغەمبەریش٦ کەسی لەهاوەڵان لەگەڵدا ناردن ئەوانیش: (مرثد بن أبي مرثد) و(خبیب بن عدی)و(زید بن الدثنة)و دوانی تریش (عبداللە بن طارق) پێشەوایان بوو لەرێگادا بەدیل گیران و بردیانن تابیانفرۆشن بەقوڕەیش، لە هەوڵێکی ڕاکردندا سیانیان شەهید بوون و سیانیان مانەوە، پێیان ووتن خۆتان بەدەستەوە بدەن هیچی خراپتان بەرامبەر ناکەین، ئەوەبوو بۆجاری دووەم بەستیاننەوە (عبداللە)ی کوڕی(طارق) ویستی ڕابکات بەڵام فریا نەکەوت و شەهید کرا، بۆیە تەنها دوانیان مایەوە، چوار هاوەڵە شەهیدەکە یەکێکیان (عاصم)ی کوڕی(ثابت) بوو، ئافرەتێك بەناوی(سداسە)وە سوێندی خواردبوو هەرکەسێك سەری بهێنێت لەنێو کاسەی سەریدا مەی دەخواتەوە، لەبەرئەوەی چوار کوڕی لەجەنگی (أحد)دا بەدەستی (عاصم) کوژرابوون، بەڵام کافرەکان نەیانتوانی سەری ببڕن لەبەرئەوەی خوای گەورە زەردە زیڕەو زەردەواڵەی ناردو نەیانتوانی نزیکی بکەونەوە، دوای خۆر ئاوابوونیش بارانێکی زۆر باریو لاشەی (عاصم)ی بردو بۆیان نەدۆزرایەوە.

دوو هاوەڵ مانەوە هەرکە گەیاندیاننە مەککە، (صفوان)ی کوڕی(أمیه)، (زید)ی کوڕی(دثنة)ی بردو لەتۆڵەی ئەوەی (بلال)،(امیه)ی کوڕی (خلف)ی کوشتبو(زید)ی کوشتەوە، دوای ئەوە کاتی مانگە حەرامەکان هاتە پێشەوەو هەر (خبیب)ی کوڕی(عدی) مابوەوە، یەکێك لەو کەراماتانەی کەلێی بینرا ئەوەبوو هەموو ڕۆژێك ئافرەتێك خواردنی بۆ دەبرد، کەچی بینی (خبیب) ترێ دەخوات لە کاتێکدا یەك دەنکە ترێ لە مەککەدا نەبوو دوای ئەوە بردیان بۆ تنعیم و بەدارخورمایەکەوە بەستیانەوەو کەوتنە ئەشکەنجەدانیو پاشان کوشتیان، ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتێکدا لەسەر مینبەر وتاری دەدا، دڵی پڕ بوو فەرمووی (جبریل) هەواڵی (خبیب)ی پێدام وسلاّوی ئەوی پێ گەیاندم ..

### وەدەرنانی (بنی نضیر) لە (مدینه) :

لەو کاتەدا جولەکە دەستیان کرد بەنامەناردن بۆقورەیش و توانای موسڵمانانیان پێ ڕادەگەیاندن، ڕۆژێك دوکەس کوژرابون دەبووایە خوێنەکەیان بدرایە ، موسڵمانانیش پارەیان نەبوو پێغەمبەر(ﷺ)ڕۆیشتە لای جووەکان هەتا قەرزیان لێبکات، ئەوانیش ویستیان پێغەمبەر(ﷺ) شەهید بکەن، بەڵام خوای گەورە بەهۆی (جبریل)ەوە ئاگاداری کردو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، پاشان (محمد)ی کوڕی(مسلمة)ی ناردو پێی ڕاگەیاندن کە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریداوە لەمەدینە دەریان بکات، یەك مانگیش ماوەی پێدان، هەرکەسێکیان دوای ئەو مانگە بمێنێتەوە لەناودەبرێت، وتیان: سەروەت و سامانەکانمان بەرین؟ فەرموی: بەڵێ ئەوە مافی خۆتانە، بەڵام سەرۆکی دووڕووەکان نامەیەکی بۆ ناردن و داوای لێکردن نەچنەدەر لەمەدینەو ئێمە بەرگریان لێدەکەین!! ئەوانیش بەگوێیان کردو لەنێو قەڵاو حەشارگەکانیاندا مانەوە خۆیان قایم کرد، پێغەمبەریش(ﷺ)

سوپایەکی بۆ ئامادەکردن و ١٥رۆژ گەمارۆیدان، پاشان خوای گەورە ترسی خستە دڵی (بنی نضیر)ەوەو تێکشکان و موسڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا .

**جەنگی (ذات الرقاع) :**

دوا ڕووداو کە لەساڵی چوارەمی کۆچیدا ڕوویدا، جەنگی (ذات الرقاع) بوو، پێغەمبەر(ﷺ)زانی کە هۆزێك خۆیان ئامادەکردووە بۆ پەلاماردانی موسڵمانان، هەرچەندە لاوازیشن، بۆیە سوپایەکی ٧٠٠ کەسی بۆ ئامادەکردن سوپاکە وڵاخی سواریان کەم پێ بوو، (أبوموسی)ی (أشعری) دەڵێت: هەر شەش کەسمان یەك وشترمان بەردەکەوت ئەوەندە ڕۆیشتین هەتا نینۆکەکانی قاچمان هەڵوەرین ونەعلەکانی پێمان دڕان جلەکانمان دەدڕاندو قاچمان پێ دەبەست، هەر بۆیە غەزاکەش ناونرا (ذات الرقاع) کاتێك گەیشتنە ئەو شوێنە هۆزەکە لەترساندا بلاوەیان لێ کردبوو.

لەکاتی گەڕانەوەیاندا، پێغەمبەر(ﷺ) ترسا لەوەی هێرشیان بکرێتە سەر، بۆیە نوێژی ترسی (صلاة الخوف)ی ئەنجامدا، کەشەویان بەسەردا هات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کێ پاسەوانیمان دەکات (عمار)ی کوڕی(یاسر) لەکۆچبەران و (عباد)ی کوڕی(بُشر) لەپشتیوانان هەڵسان و سەرلوتکەی چیاکەیان گرت، (عباد)بە (عمار)ی وت: تۆ نیوەی یەکەم بخەوەو نیوەی دوەمیش من، لەوکاتەدا کەپاسەوان بوو دووڕکات نوێژی دابەست یەکێك لەکافرەکان هاتە سەریو بە تیروکەوان دای لەشانی، لەو کاتەدا سورەتی (الکهف)ی دەخوێند، شوێنەکەی بەست و دەستی کردەوە بە نوێژ کردن، تیری دووەمیشی تێگرت، شوێنی ئەویشی بەست و دەستی کردەوە بە نوێژ کردن، هەتا تیری سێیەمی بەرکەوت



ئینجا سوژدەی بردو نوێژەکەی تەواو کرد، ئەوسا (عمار)ی هەڵساند، (عمار) پێی ووت بۆ هەر لەیەکەم تیرەوە هەڵت نەساندم ووتی لەنوێژەکەمدا سورەتی (الکهف)م دەخوێند ئەوحاڵەتەم بەلاوە کەمتر بوو لەوەی واز لە خوێندنی بهێنم خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا فەرمانی پێنەکردمایە پارێزگاری لە موسڵمانان بکەم هەرگیز کۆڵم نەدەدا .

لەکاتی گەڕانەوەی موسڵماناندا پێغەمبەر(ﷺ) وەکو هەر هاوەڵێکی تر زۆر ماندووبوو بۆیە لایدایە ژێر سێبەری دارێك، یەکێك لە کافران فرسەتی هێناو هەڵی کوتایە سەری‌و شمشێرەکەی خستە سەرگەردنی و هەڵیساند پێ وت: کێ دەتوانێت دەستم بگرێت، پێغەمبەر(ﷺ)بەوپەڕی متمانەوە فەرمووی: الله، شمشێرەکە لەدەستی کابرا بەربووەوەو پێغەمبەر(ﷺ) هەڵیگرتەوەو خستیە سەر گەردنی‌و فەرمووی: ئەی تۆ کێ هەیە ڕزگارت بکات لە دەستم، وتی ئەی (محمد) هەر خۆت چاکە خوازیت، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: باشە باوەڕ بەخواو پێغەمبەرەکەی دهێنیت؟ کابرا وتی: نەخێر، ئینجا فەرمووی: دەی کەواتە دوژمن مەهێنەسەرم و بڕۆ کابرا وتی: باشە، پاشان پێی فەرموو: ئەتوانیت بڕۆیت ئازادیت.

پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە، لەکاتی گەڕانەوەیاندا(جابر)ی کوڕی (عبدالله) دواکەوت ئەوکەسەی کە باوکی لەجەنگی (أحد)دا شەهید کراو ٩کچی لەدوا بەجێ‌ما، لەنێوان ئەوو پێغەمبەری خوادا گفتوگۆیەك ڕویدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (جابر)ئەوە چیتە، جابر وتی: یارسول الله ووشترەکەم، فەرمووی: (جابر)چیەتی، وتی: (یارسول الله) لاوازە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (جابر) ژنت هێناوە؟ وتی: بەڵێ (یارسول الله)، فەرمووی: کچ بوو؟! (جابر)

وتی: نەخێر (یارسول الله) باوکم لەجەنگی (أحد)دا شەهید بوو نۆکچی بەسەردا جێ هێشتم لەبەرئەوە ژنێکم هێناوە هەتا خزمەتیان بکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چاکت کردوە ئەی (جابر)، ئینجا فەرمووی: (جابر) ئەزانیت کە نزیکی مەدینە بوینەتەوە ناچینە ناوی هەتا هاوسەرەکەت بەهاتنەوەت نەزانێت و جێگەی حەوانەوەت بۆ ئامادە نەکات، جابر وتی بەخوا نیمانە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی جابر ئەبێت (انشاء الله).

پاشان پرسی: (جابر) وشترەکەت دەفرۆشی، (جابر) وتی بەکەڵکی فرۆشتن نایەت بەڵام ئەگەر وەریبگریت وەك دیاریەك پێت دەبەخشم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی نەخێر لێت دەکڕم، کە گەیشتە (مدینە) (جابر) وشترەکەی برد بەکۆڵەکەی ماڵی پێغەمبەرەوە بەستیەوەو ڕۆیشتەوە ماڵەکەی خۆی، پێغەمبەر(ﷺ) (بلال)ی ناردو وشترەکەی گێڕایەوە بۆ(جابر)، ئابەم شێوازە جوانە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا لەجەنگی (ذات الرقاع)دا مامەڵەو ڕەفتاری کرد، سەڵاوات لەسەرگیانی پاکی گەورەمان (محمد) بێ(ﷺ).

## جەنگی خەندەق وتۆکمەیی کۆمەڵگە :

جولەکەو قورەیش و عەرەبەکان بەگشتی بۆیان دەرکەوت کەلەناوبردنی پێغەمبەر(ﷺ) کارێکی زۆر ئەستەمە، بۆیە ٢٠کەس لەسەرانی جولەکەو گەورە پیاوانی (بنی النضیر) ڕۆیشتن بۆلای قورەیش لە مەککە هەتا هەڵیانبنێن بۆ پەلاماردانی مەدینەو ئەوانیش لەکۆمەکی دریغی ناکەن، قورەیش ئامادەییان دەربڕی، پاشان سەردانی هۆزی (غطفان)یان کردو ئەوانیش ئامادەییان دەربڕی، لەوەودوا بەناو تیرەوهۆزە عەرەبەکاندا گەڕان و ئامادەیی زۆربەیان دەستە

بەرکرد. بەم شێوەیە نەخشەی سەرانی جولەکەو سەرکردەکانی سەری گرت لە کۆکردنەوەی کافرەکان بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ)وبانگەوازەکەیو موسڵمانان.

قورەیش لەباشورەوە هاتن و (کنانە)وهاوپەیمانەکانیان لە توهامەوە بەچوار هەزار جەنگاوەرە بەسەرۆکایەتی (أبوسفیان) هەروەها (بنوسلیم) لە (ظهران)ەوە، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە تیرەو هۆزەکانی (غطفان) هاتن، ئەوسا هەموویان بەرەو (مەدینە) پێشڕەوییان کرد، بەردەوام هەواڵەکان یەك لەدوای یەك دەگیشتنە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئینجا کەوتە ڕاوێژکردن بە هاوەڵان، (سلمان)ی فارسی پێشنیاری هەڵکەندنی خەندەقی کرد بەدەوری (مەدینە)دا پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی کردە چەند دەستەیەك، هەر دەستەیەك لە٢٥کەس پێك هاتبوون، بەرپرسێکی بۆ هەر دەستەیەك دیاری کرد، هەتا کارەکەیان بەرێك و پێکی ئەنجام بدەن لەلایەکی ترەوە هاوەڵان دوچاری برسێتیو ماندووبونێکی زۆر بوون، کەچی چالاکانە کارەکانیان ئەنجام دەداو بەدەم برسێتیو سك هەڵوشین و هەڵکەندنی چاڵەوە ئەم شیعرەیان دەووت :

خوایەگیان ئەگەر تۆ نەبای ڕێبازی هیدایەتمان نەدەگرت

نەخێرمان دەکردو نەنوێژمان دەکرد

تۆ ئارامیت دابەزاندە سەرمان

داواکارین دامەزراومان بکەی کاتێك دوژمن دێتە سەرمان

پێغەمبەریش(ﷺ) بەسەریاندا دەگەڕاو دەیفەرموو:

اللهم إن العيش عيش الأخرة

فأغفر للأنصار والمهاجرة

واتە: خوایەگیان بەڕاستی ژیان ژیانی ئەو جیهانە ، دەخۆش ببە لەپشتیوانان و کۆچبەران.

ئەوانیش وەڵامی پێغەمبەری خوایان دەدایەوە ودەیانوت :

نحن الذين بايعوا محمداً          على الجهاد مابقينا أبداً

ئێمەین کە پەیمانمان داوە بە (محمد) ، کە تێکۆشان بکەین هەتا ماوین.

### چەند کەراماتێک لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقدا :

لەوحاڵەتانەی کەلەکاتی هەڵکەندنی خەندەقدا ڕویدا (جابر)ی کوڕی(عبدالله) برسیەتی زۆری لە ڕوخساری پێغەمبەردا(ﷺ)بەدیکرد، بۆیە بۆنان خواردن بانگی کردە ماڵی خۆیان، پێغەمبەریش (ﷺ) سەرجەم هاوەڵانی کۆکردەوە کەژمارەیان لە هەزارکەس پتربوو، لە خزمەتیدا چون بۆماڵی جابر، سەرجەمیان تێریان خوارد خوارنەکەشی هەر وەکو خۆی مایەوە .

لەکاتی هەڵکەندنی خەندەقەکەدا بەردێکی گەورە هاتە بەردەم هاوەڵان و نەیان دەتوانی بیشکێنن، پێغەمبەر(ﷺ)تەشریفی هێناو قوڵنگەکەی هەڵگرت و فەرمووی (بسم الله)و بەهەموو هێزی پیایدا ماڵیو، فەرمووی: (الله اكبر) کلیلی شامیان پێدام، سوێند بەخوا کۆشکەکانیان دەبینم، پاشان دانەیەکی تری پیاماڵیو فەرمووی: (الله اكبر )، سوێند بەخوا ئێستا کۆشکی سپیو مەدائن بەدی دەکەم، پاشان جارێکی تریش پیایداماڵی، ئیتر بەردەکە تەواو ورد بوو فەرمووی: (الله أكبر)، کلیلەکانی یەمەنم پێدرا سوێند بەخوا دەروازەکانی (صنعاء) لەم شوێنەوە دەبینم .



پێغەمبەر(ﷺ) بە ٣ هەزار سەربازەوە هاتەدەر پاڵی دان بە کێوی (سلع) ەوە، لەوێدا خۆیان بەتوندی حەشاردا خەندەقەکەیش لە نێواندابوو(ابن ام مکتوم)یشی کردە جێنشینی خۆی لەسەر (مدینە).

**دەستپێکردنی جەنگی (الأحزاب) :**

یەکێك لە ئازاو پاڵەوانەکانی هاوەڵگەران (عمرو)ی کوڕی(عبود) بوو ویستی لە خەندەقەکە بپەڕێتەوە، (علی) قارەمان هەڵمەتی بۆ بردو لە شوێنی خۆیدا کوشتی، لە ڕۆژانی داهاتودا چەند کەسێکی تریان هەوڵیاندا بپەڕنەوە، بەڵام ڕووبەڕووی بەرگری توندی موسڵمانان بونەووەو تیرباران کران، هەتا سەرجەم هەوڵەکانیان شکستی خوارد، جا لەودەمەدا هەواڵی خیانەتی جووەکانی (بنی قریضة) گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە کەوتە نەخشەدانان بۆ ڕوبەڕووبونەوەی ئەو پیلانە نوێیە یەکێك لە پلانەکانی ئەوەبوو پاسەوانێکی نارد بۆ مەدینە بۆ بەدیهێنانی ئامانجی سەرکەوتن،سەرەتا ویستی لەگەڵ هەردوو سەرۆکی هۆزی (غطفان)،(عیینە)ی کوڕی(حصن)و(حارث)ی کوڕی(عوف)دا ڕێبکەوێت لەسەر سێ ەکی بەروبومی ئەوساڵەی مەدینە بەومەرجەی لەو جەنگە پاشەکشەبکەن هەتا موسڵمانان بتوانن شکستێکی گەورە دوچاری قوڕەیش بکەن، بۆ ئەو مەبەستە ڕاوێژی لەگەڵ (سعد)ی کوڕی (معاذ)و(سعد)ی کوڕی(عبادە)دا کرد هەردووکیان وتیان: (یارسول الله) ئەگەر خوای گەورە فەرمانی پێکردوی ئەوا ئێمە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداریین، ئەگەر لەبەر ئێمە دەیکەیت ئەوا ئێمە پێمان باش نیە چونکە ئێمە لەگەڵ (غطفان)دا لەسەردەمی بت پەرستیدا هاوکارو هاوبەش بوین، ئەوان تەماعیان نەکردۆتە بەروبومی ئێمە بەکڕین و فرۆش نەبێت کاتێکیش خوای گەورە بەم ئیسلامە ڕێزی لێناوین و ڕێنمویی کردین و بەتۆ سەربەرزی کردوین ماڵ و سامانی خۆمانیان بدەینێ؟! سوێند بەخوا شمشێرنەبێت هیچی تریان نادەینێ، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕاکەی

ئەوانی لاپەسەند بوو بۆیە فەرمووی: خەمی ئێوەمە، چونکە ئەوەتە هەموو عەرەب هاتونەتە سەرتان .

پاشان خوای گەورە کارێکی کرد دوژمنی سەرشۆڕکردو کۆمەڵیانی پەرتەوازە کردو، ئەویش بەوەی پیاوێکی سازاند ناوی (نعیم)ی کوڕی(مسعود) بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: (یارسول الله) من بەنهێنی موسڵمان بووم فەرمانت بەچی یە ئامادەم، ئەویش فەرمووی: جەنگ پلان و فێڵ و فریودانە ئەوسا دەست بەجێ (نعیم) هەستاو چوو بۆلای (بنی قریضة)و پێی وتن خۆتان دەزانن خۆشەویستیو پەیوەندیمان پێکەوە چۆنە وتیان: ڕاست دەکەیت، وتی قوڕەیش وەکو ئێوە نین ئەم شارە شاری خۆتانە، ماڵ و مناڵ و سامانتان لەم شارەدایە ناتوانن کارێك بکەن زیان بەم بەرژەوەندیە گەورانەی خۆتان بگەیەنن، بەڵام ئەوان هیچ کام لەو بەرژەوەندیانەیان لەمەدینەدا نیە لەبەرئەوە هەر هەلێکیان بۆ ڕێك بکەوێت ئەنجامی دەدەن و گوێ نادەن بەهیچ بەرژەوەندیەکی ئێوە هەرکاتێ کەزانیان سەر ناکەون جێتان دەهێڵن و دەتان دەنە دەست(محمد )و هاوەڵانی ئەوانیش تۆڵەی خۆیانتان لێدەکەنەوە، وتیان: ئەی چی بکەین باشە؟ (نعیم) وتی:لەگەڵیاندا مەجەنگێن هەتا بارمتەتان نەدەنێ. وتیان : ڕایەکی باشە.

دوای ئەوە ڕۆیشت بۆلای قوڕەیش، پێی وتن: ئێوە دەزانن چەند ڕێزتان هەیە لام و پەیوەندیم لەگەڵتان چۆنە ووتیان: بەڵێ وایەو دەزانین، وتی: جولەکە پەشیمان بونەتەوە لەو پەیوەندیەی لەگەڵ ئێوەدا لەدژی (محمد) گرێیان داوە بۆئەو مەبەستە پەیوەندییان پێوە کردوەو بەڵێنیانداوە چەند کەسێك لەئێوە وەك بارمتە لایان بێت، بەڵام دواتر دەیدەنە دەست (محمد)و هاوەڵانی، لەبەر ئەمە

ئەگەر داوای بارمتەیان کرد مەیاندەنێ چونکە نیازیان خراپە، پاشان چوو بۆلای (غطفان )یش بە هەمان شێوە .

جا موسڵمانان لە خوای گەورە دەپاڕانەوەو دەیانوت: خوا یەگیان نەنگیمان بپۆشەو ترس لە دڵمانا بڕەوێنەوە پێغەمبەر(ﷺ)دوعای لە (احزاب) دەکردو دەیفەرموو: ئەی خوای هەورەکان، ئەی ئەوزاتەی کە لێپرسینەوە بەخێرایی ئەنجام ئەدەیت.. گرۆکان تێك بشکێنەو هەڵیانتەکێنە.

ئیتر دوبەرەکی کەوتە نێوانیان پاشان خوای گەورە ڕەشەبایەکی توندو ساردو بەهێزی ناردە سەریان، ڕەشماڵ و کەل و پەلیانیدا بەسەریەکداو پەرتەوازەی کردن، پاشان پۆلە فریشتەیەکی ناردەسەریان ترس و بیم بخاتە دڵیانەوە، بەو شێوەیە خوای گەورە وادەی خۆی بردە سەر، پێغەمبەرەکەی(ﷺ)و بەندەکانی خۆی سەرخست و دوژمنانی تێکشکاند.

**◉ ڕوداوی (الأفک )و پاراستنی کۆمەڵگە لە پڕو پاگەندە :**

لەگەڕانەوەی پێغەمبەری خوادا لەجەنگی (بنی مصطلق) کەلەمانگی شەعباندا لەساڵی ٦ی کۆچیدا ڕویدا، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی پشویەك بەسوپاکەی بدات، بەڵام سەرۆکی دووڕووەکان(عبدالله)ی کوڕی(أبی) هەڵسا بەبڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەیەك کەناونرا ڕوداوی(الأفك) چونکە ووشەی (الأفك) گەورەترە لەدرۆ، بوختانی گەورەو ناقۆڵاو بێجێ دەگەیەنێت کورتەی ڕوداوەکەش تۆمەت دروستکردن بوو بۆ خاتوو (عائشە) دایکی ئیمانداران .

پێغەمبەر(ﷺ) بۆهەر سەفەرێك بڕۆیشتایە تیروپشکێکی دەکرد لەنێوان هاوسەرەکانیدا هەتا یەکێکیان لەگەڵیدا بڕۆنە دەر، ئەوجارە خاتوو (عائشە) لە تیروپشکەکەدا دەرچوو، جا لەکاتی گەڕانەوەیاندا لە جەنگی (بني مصطلق)



خاتوو عائشە بۆ کارێکی تایبەت، لە سوپاکە دابڕا دوای تەواوبوونی کارەکەی، هەستی کرد ملوانکەکەی دیارنیە، دەستی کرد بەگەڕان بەڵکو بیدۆزێتەوە، لەشکر خۆی کۆکردەوەو ئەوچەند کەسەی کەبەرپرسی‌کەژاوەکەی بوون، وشترەکەیان ئامادەکردو باریانکردو وایان زانی خاتوو (عائشە)ی تێدایە، ئەو کاتە تەمەن منداڵ و جەستەی لاواز بوو، دوای ئەوەی خاتوو (عائشە) ملوانکەکەی دۆزییەوە گەڕایەوە بۆلای سوپاکەو کەژاوەکەی، بەڵام کەسی لێ نەمابوو بۆیە هەر لەشوێنی خۆیدا مایەوە، بەدەم چاوەڕوانیەوە خەوی لێ کەوت، هەتا (صفوان )ی‌کوڕی(معطل) کەیەکێکە لەکۆچبەران و کاری ئەوەبوو کەدوای هەموان بکەوێتەڕێ هەر کە خاتوو(عائشە)ی بینی وتی (إنالله وإناإليه راجعون) ئینجا پشتی تیێ‌کردو وشترەکەی بۆ یخدا تاسوار ببێت بێ ئەوەی یەك ووشە قسەی لەگەڵدا بکات هەتا گەڕاندیەوە ناوسوپاکە کاتێك سوپا ئەم دیمەنەیان بینی هەر یەکێك بۆچوونی خۆی لەو دیمەنە دووا، سەرۆکی دووڕووەکان هەلێکی باشی بۆ ڕەخسا، تا ژەهری خۆی بڕێژێت، بۆیە کەوتە بلاوکردنەوەی تۆمەت و قسەو قسەلۆك لە نێوان ڕیزی سوپادا.

کاتێك خاتوو (عائشە) گەیشتەوە مەدینە ماوەی مانگێك نەخۆش کەوت و هیچی دەربارەی ئەو بوختانە نەدەزانی، تەنها ئەوەنەبێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بە غەمباریەوە دەهاتەوە لای، یەکێك لەشەوەکان خاتوو(عائشە)لەگەڵ (أم مطع)دا بۆ پێداویستیەکی خۆی ڕۆیشتەدەر (أم مطع) پێی هەڵکەوت، کەچی نزای لە کوڕەکەی خۆی کرد، دایکی ئیماندارانیش پێی ناخۆش بوو، ئیتر ئەوکاتە دەنگ و باسەکەی بۆ گێڕایەوە ...

خاتوو(عائشە) گەڕایەوە ماڵەوەو ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەیری کرد بێدەنگ و غەمبار دانیشتووە، وتی: مۆڵەتم دەدەی بڕۆم بۆ ماڵی باوکم،تا دایکم خزمەتم بکات؟ خاتوو (عائشە) دەڵێت: مۆڵەتی دام و ڕۆیشتم بۆ لای دایکم و وتم: دایکە خەڵکی دەربارەی من چی دەڵێن، دایکم وتی: کچی خۆم هێوربەرەوە، هیچ ئافرەتێکی جوان نیە کە خۆشەویستی مێردەکەی بێت، درۆو تۆمەتی بۆ هەڵنەبەسترێت. خاتوو (عائشە) وتی: خەڵکی وام پێ دەڵێن ؟! دایکی وتی: بەڵێ، خاتوو(عائشە) وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) زانیویەتی، دایکی وتی: بەڵێ، وتی: ئەی باوکیشم زانیویەتی، دایکی وتی: بەڵێ: خاتوو(عائشە) دەڵێت: یەکسەر ڕۆیشتم بۆلای باوکم لەسەربان بوو قورئانی دەخوێند بۆم دەرکەوت گوێی لەقسەکانمان بووە، سەیری ڕوخساریم کرد، چاوەکانی ئەسرینی لێدەباری، پێم ووت: باوکە تۆچی دەڵێیت؟ ئەویش گریاو وتی: (واللە) کچی خۆم لەسەردەمی نەفامیدا کەسێك تۆمەتی وای بۆ خانەوادەی (أبو بکر) دروست نەکردوە، کاتێك خوای گەورە بەئیسلام ڕێزداری کردین، سەیرە، ئاوامان پێ دەڵێن؟ ئەوسا منیش خۆم پێ نەگیراو گریام دوو شەوو ڕۆژ هەر گریام ...

هاوەڵانیش بووبوون بەدوو بەشەوە، بەشێك بێدەنگ و بەشێك سەرسام .. پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هێناو فەرمووی: ئەی عائشە پێم گەیشتووە ئاواو ئاوات پێ دەڵێن، ئەگەر پاك بیت ئەوا خوا پاکیت دەردەخات، ئەگەر گوناهێکیشت کردووە داوای لێ خۆش بوون بکەو تۆبە بکە، ئەگەر بەندەیەك دانی نابە گوناهەکەیداو پاشان تەوبەی کرد، خوای گەورە تەوبەی لێ وەردەگرێت، لەوکاتەدا فرمێسکەکانم ووشك بوەو بەدایك و باوکمم وت: بۆ وەڵامی نادەنەوە، ئەوانیش نەیان دەزانی چی بڵێن، ئینجا وتی: سوێند بەخوا



ئەزانم بڕواتان بەڕووداوەکە کردووەو لەدڵتاندا جێگیر بووە، ئەگەر پێتان بڵێم کاری وام نەکردوە، بڕوام پێ ناکەن، خۆ ئەگەر دانیش بەشتێکدا بنێم کە خوا دەزانێت بەریم لێی بڕوام پێ دەکەن، هیچ نمونەیەك بۆ ئەم حاڵەتەی خۆم شك نابەم فەرمایشتی باوکی یوسف نەبێت کە فەرموویەتی:﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾،پاشان ڕۆیشتمەوە سەرجێگاکەم، دوای ماوەیەك سروشی خوایی نازڵ بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ)زەردەخەنەو خۆشحاڵی ڕوخساری پیرۆزی داگرت بۆیە فەرمووی: (عائشە) خوای گەورە پاکێتی ئاشکرا کرد، دایکی پێی وت: هەڵسە بچۆ بۆلای.. خاتوو (عائشە) وەك نازێك بەپاکێتی خۆیو متمانەی بەخۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی: (واللە) هەڵناسم، تەنها سوپاسی خوا نەبێت سوپاسی کەس ناکەم !!

پاشان ئەوانەی ئەو درۆو بوختانەیان دەماودەم دەوتەوە هەریەکەیان ٨٠ جەڵدەیان لێدرا.

بەڵێ، دوای مانگێك هەوری گومان و دوودڵی لەکەش و هەوای مەدینەدا ڕەوییەوە، سەرۆکی دووڕووەکانیش بەشێوەیەك ڕیسوا بوو، کەڕووی نەدەهات سەر بەرزبکاتەوە.

### ۞ پەیمانی (حدیبیە) :

لەساڵی شەشەمی کۆچیدا شاری مەدینە ترس و دڵەڕاوکێی تیانەماو ئاسایش وئاشتی باڵی کێشا بەسەر شاردا، لەیەکێك لەشەوەکاندا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخەودا بینی خۆی و هاوەڵانی دەڕۆن بۆ مزگەوتی (حرام)و کلیلی (کعبە)شی پێیەو بەدەوریدا (طواف) دەکەن و (عمرە) ئەنجام دەدەم، هەندێکیان سەریان تاشیوەو هەندێکیان کورتیان کردوەتەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم خەوەی

بەوە لێکدایەوەکە (عمرە)دەکات، بۆیە بڕیاریدا بەرەو مەککە بڕوات ئەوسا بەنیەتی (عمرە) ئیحرامی بەست و نزیکەی١٤٠٠ لە هاوەڵان لەخزمەتیدا بوون، تەنها چەکی سەفەریان پێ بوو، کاتێك لە (عفان) نزیك بونەوە (عیینە) هاتە لایی‌و، وتی (کعب)ی‌کوڕی(لؤی)یەم جێ‌هێشت حەبەشیەکانی بۆ کۆکردبویتەووە، تا نەهێڵن بڕۆیتە نێو (کعبە)وە، پێغەمبەر(ﷺ)ڕاوێژی کرد بە (أبو بکر) ئەویش فەرمووی: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، ئێمە بۆ(عمرە) هاتووین نەك بۆ بەرپاکردنی جەنگ، هەرکەسیش ڕێمان پێ‌بگرێت ئێمە هەڵوێستی خۆمان دەبێت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگایەکی پڕ هەورازو نشێوی گرتەبەر، سەیر لەوەدا بوو کوتوپڕ وشترەکەی وەستا، خەڵکەکە وتیان: ئیتر نارِوات مانی گرتووە!!، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی نەخێر مانی نەگرتووەو عادەتی وای نیە ...

بەڵکو شتێکە وەك بەسەرهاتی فیلەکان کەبەرەو مەککە ئەچوون، پاشان فەرمووی: بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە هەر نەخشەیەکیان بێت بەمەبەستی بەگەورە ڕاگرتنی دروشمە پیرۆزەکانی خوا ئەیاندەمێ، ئینجا وشترەکە ڕاست بوەوەو ڕۆیشت هەتا گەیشتنە ئەوپەڕی(حدیبیە) لەسەر حەوزێکی کەم ئاو لایاندا هاوەڵان سکاڵای کەم ئاوییان لای پێغەمبەر(ﷺ)کرد، ئەویش تیرێکی دەرهێناو فەرمانی پێکردن بیکەن بەناو حەوزەکەدا، ئیتر ئاوی سەرکەوت و هەموو هاوەڵان و سەرجەم ماڵاتەکانیان تێر ئاو بوون و خۆیان لێ شت، پاشان قوڕەیش هەندێ کەسی نارد بۆ دانوستان، لەوانە (بدیل)ی کوڕی(ورقاء) هات، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئێمە بۆ کوشتارو جەنگی کەس نەهاتوین و نیازمان (عمرە)یە، (قریش) جەنگ ماندووی کردون و زیانی پێ گەیاندون، ئەگەر بیانەوێت کۆمەکییان دەکەین، ئەوانیش ئازادی بدەن بە من بانگەوازی خۆم



بەخەڵکی ڕابگەیەنم هەتا بەویستی خۆیان ئەو ئاین وبەرنامەیە هەڵدەبژێرن کەخۆیان قەناعەتیان پێیەتی، ئەگەر وانەکەن ئەوا جەنگ دوا بڕیارمانە، سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە لە گەڵیاندا دەجەنگم تا لە پێناویدا تیا دەچم یان خوای گەورە ویستی خۆی جێبەجێ دەکات.

دوای ئەم قسانە (بدیل) گەڕایەوە تا گەیشتەوە ناو قورەیش وپێی وتن: لای پیاوێکەوە هاتومەتەوە کە گوفتاری بەجێی پێیە، ئەگەر بتانەوێت پێتان دەڵێم. کەچی کاڵ فامەکانیان وتیان: پێویستمان بە قسەی ئەونیە، بەڵام خاوەن ڕاکانیان وتیان ئادەی بۆمان باس بکە چی وت: ئەویش بۆی گێڕانەوە ، ئینجا کەسێکی تریان بەناوی (مکرز بن حفص) نارد، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)بینی لە دوورەوە دەهات فەرمووی: ئەم پیاوە پیشەی خیانەت کردنە، کاتێك گەیشتە لای پێغەمبەر(ﷺ)هەر هەمان فەرمایشتەکانی پێشوی بۆ ئەویش دوبارەکردەوە، (مکرز)یش گەڕایەوە بۆ لای‌قورەیش و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری(ﷺ)بۆ گێڕانەوە، ئینجا کەسی سێیەمیان نارد کەناوی (حلیس بن علقمه ) بوو. کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)(حلیس)ی لەدورەوە بینی فەرمووی: ئەم پیاوە سروتە خواییەکان بەگەورە دەگرێت لەبەرئەوە ماڵاتەکان بەرەڵا بکەن بابیانبینێت،هەروەها بەدەنگی بەرز (لبیك اللهم لبیك) بڵێن، (حلیس) بەبینینی ئەم دیمەنە لەجێی خۆیدا وەستاو گەڕایەوە ناو قورەیش و وتی: ئەی هۆزی قورەیش کەی ڕەوایە، خەڵکی بێ نرخ و کاڵ فام لە خۆتان کۆبکەنەوە تا دەست بگرن بەسەر ماڵی خواداو ڕێگە لەنەوەی (عبد المطلب)یش بگیرێت؟! سوێند بەخوا ئەگەر قورەیش لەسەر ئەم کارەیان بەردەوام بن تیا دەچن. پاشان (عروه بن مسعود)یان نارد ئەویش وتی: بەمەرجێك دەڕۆم هەر مەرجێکم لەسەر (محمد) دانا نابێ سەرپێچیم بکەن،

کاتێك (عروە) گەیشتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)وتی: (محمد) وادەبینم خەڵکی هەرچیو پەرچیت لەخۆت کۆکردوەتەوە، (أبوبکر) لەوکاتەدا لە پشتی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەستا بوو بەرپەرچی دایەوە ، (عروە) وتی: ئەمەکێ یە قسەم پێ دەڵێت، فەرمووی ئەوە (أبوبکر)ی (صدیق)ە ، (عروە)(ابوبکر)ی نەناسییەوە چونکە قەڵغانی دەرەدامانی لەبەردابوو، (عروە) دەستی برد بۆ ریشی پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست قسەی بۆ بکات، (مغیرە) بەدەسکی شمشێرەکەی دای بەدەستیدا !!

(عروە)گەڕایەوە ناو قورەیش، ئینجا(٧٠) ئەسپ سواریان بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید نارد هەتا جەنگ بەرپا بکەن، ئەوەبوو کۆمەڵێکیان هەوڵیاندا دزەبکەنە سەربازگەی موسڵمانانەوە، بەڵام (محمد)ی کوڕی(مسلمة) سەرۆکی پاسەوانەکان هەموویانی بەدیل گرت.

لەوکاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) ویستی باڵوێزێکی خۆی بنێرێت هەتا هەڵوێست و ئامانجی ئەم سەفەرەیان بۆ ڕوون بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە (عمر)ی بانگ کرد بەڵام ئەو داوای لێ بوردنی کردو وتی: لەنێو (مکە)دا کەس لەهۆزی (بنی کعب) لەنێو مەککەدا نەماوە تا ئەگەر ئازار درام بەرگریم لێ بکەن، ئەوسا(عثمان)ی کوڕی(عفان)ی نارد لەبەر ئەوەی هۆزەکەی خاوەن دەسەڵات بوو بانگی کردو پێی فەرموو: پێیان ڕابگەیەنە ئێمە بۆ جەنگی کەس نەهاتووین بەڵکو بۆ (عمرە) هاتوین، بانگیان بکە بۆ ئیسلام پاشان فەرمانی پێکرد، پیاوان و ژنانی باوەڕدار لەمەککەوە لەگەڵ خۆیدا بهێنێت و مژدەی ڕزگاری یەکجاریان بداتێو پێیان بڵێ خوای گەورە ئەم ئایینە نوێیە لەمەککەدا سەردەخات، ئیتر کەسی بڕوادار لەوە زیاتر بەنهێنی خوا پەرستی ناکات .

کاتێك (عثمان) گەیشتە مەککە، قورەیش زیندانییان کرد، هەواڵ لەنێو موسڵمانانندا بڵاوبوەوە کە (عثمان ) شەهیدکراوە، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: کۆڵ نادەین هەتا تۆڵەیان لێ نەکەینەوە.

پاشان داوای لە هاوەڵان کرد پەیمانی پێ بدەن، سەرجەم هاوەڵان پەیمانیان پێدا کەرانەکەن، هەندێکیان پەیمانی مەرگیان پێدا، ئەم پەیمانە لەژێر درەختێکدا ئەنجامدراو ناونرا پەیمانی (رضوان ) .

ئینجا قورەیش هەستی بەهەستیاری هەڵوێستەکە کرد، بۆیە خێرا (سهیل)ی کوری(عمرو)یان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، تارێکەوتنێکیان لەگەڵدا ببەستێ.. یەکێك لەمەرجەکانی قورەیش ئەوەبوو کەدەبێت ئەمساڵ بگەرێنەوە بۆ ئەوەی عەرەب نەڵێن بەزۆر خۆیان کرد بەمەککەدا .

**کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) (سهیل)ی بینی فەرمووی: وادیارە خوای گەورە کارەکەی بۆ ئاسان کردون، ئینجا (سهیل) هات و زۆر قسەی کرد پاشان لەسەر چەند بنەمایەکی ئاشتەوایی رێکەوتن :**

١- پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ساڵ بگەرێتەوەو نەیەتە ناومەککەوە، لەساڵی داهاتویشدا نابێت لەسێ رۆژ زیاتر تیا بمێننەوە تەنها شمشێری سەفەریان پێ بێ و هیچ کەسێکیش لەقورەیش بۆی نیە رێگەیان لێ بگرێت.

٢- ماوەی ١٠ساڵ جەنگ لە نێوانیاندا رابگیرێت و خەڵکی لەژێر سایەی ئاشتی و ئاسایشدا بژین و رێگە بەیەکتری نەگرن .

٣- هەرکەسێك ویستی بچێتە پاڵ (محمد)و پەیمانی پێ بدات ئازادە، هەر کەسێکیش ویستی بچێتە پاڵ قورەیش و پەیمانیان پێ بدات هەر ئازادە، ئەوکاتە ئەو کەسە بەیەکێك لەئەندامانی ئەو لایە هەژمار دەکرێت.

هەر دوژمنکاریەك بکرێتە سەر هەر تیرەو هۆزێك لە هەردوولایان بەدوژمنایەتی کردنی بەرامبەر هەژمار دەکرێت .

٤- هەرکەسێك لە قورەیش خۆی دایە پاڵ(محمد) بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی دەبێت(محمد) بیگێڕێتەوە، هەر کەسێکیش لای (محمد)ەوە گەڕایەوە ناو قورەیش (محمد) بۆی نیە داوای بکاتەوە!!.

دوای ئەوەی هەردوولا بە خاڵەکان ڕازی بوون پێغەمبەر(ﷺ) (علی) بانگ کرد تا ڕێکەوتننامەکە بنوسێت، سەرەتا فەرمووی: بنوسە: (بسم الله الرحمن الرحیم) (سهیل) وتی: (والله ) نازانم (الرحمن) کێیە!! بەڵکو بنوسە (باسمك اللهم) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا بە(علی) کە قەیناکات وابنوسە، پاشان فەرمووی: بنوسە ئەم ڕێکەوتننامەیە لەنێوان(محمد رسول الله)و(سهیل)ی کوڕی(عمرو)دا ئەنجام درا، (سهیل) فەرمایشتەکەی پێ بڕیو وتی: ئەگەر ئێمە تۆمان بەپێغەمبەری خوا بزانیایە ڕێگەمان لێنەدەگرتیت ناوی خۆت و باوکت بنوسە!!، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا بە(علی) کەبنوسێت (محمدی کوڕی عبدالله)و (رسول الله) بکوژێنێتەوە بەڵام (علی) وتی: بەخوا ئەمەیان ناکەم!!، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)بەدەستی خۆی (محمد رسول الله)ی کوژاندەوە، پاشان نوسینەکە تەواو کراو مۆرکرا، ئەوسا هۆزی (خزاعە) پەیمانیان مۆرکرد کە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)دەبن .

ئینجا بە هاوەڵانی فەرموو، هەستن ماڵاتەکان سەرببڕن، سێ جاریش فەرمووی!!

بەڵام یەك کەس هەڵنەسا بەئەنجامدانی، کاتێك کەس گوێڕایەڵی نیشان نەدا پێغەمبەر(ﷺ) لە شوێنی خۆی هەستاو ڕۆیشت چوو بۆلای (ام سلمة)و نافەرمانی هاوەڵانی بۆ گێڕایەوە، (ام سلمة) وتی: (یارسول الله) حەزدەکەیت ئەو

کاره ئەنجام بدەن؟ خۆت بچۆو قسه لەگەڵ کەسدا مەکە، وشترەکە سەربڕەو بانگی سەرتاشەکەت بکە باسەرت چاك بکات، ئیتر بەدوای تۆدا ئەوانیش دەیکەن، پێغەمبەر(ﷺ)هاتەدەرو وای کرد، ئەوسا سەرجەم هاوەڵانیش دەستبەکار بوون و ماڵاتەکانیان سەربڕی‌و سەری خۆیان تاشی و ئیحرامیان شکاند !!

**غەزای (مؤتة) :**

پێغەمبەر(ﷺ) (حارث)ی کوڕی(عمیر)ی بەنامەیەکەوە نارد بۆلای پاشای (بُصری) و تیایدا بانگی کرد بۆ ئیسلام بەڵام پێش ئەوە (حارث) بگاتە ئەوێ یەکێك لەسەرکردەکانی ڕۆم یەخەی پێ گرت و شەهیدی کرد، بەمەش دابونەریتی بالیۆزو سەفیری پێشێل کرد .

بێگومان ئەمە دژایەتیەکی ئاشکرا بوو بۆ موسڵمان و ڕاگەیاندنی جەنگ بوو دژیان، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا سوپایەکی سێ هەزار جەنگاوەری ئامادەکرد تا هێرش بکەنە سەر١٥٠هەزار سەربازی ڕۆم، بەسەرۆکایەتی (زید)ی‌کوڕی(حارثة)، پاشان فەرمووی ئەگەر (زید)پێکرا با(جعفر)ی کوڕی(ابوطالب) سەرکردە بێت ئەگەر ئەویش پێکرا (عبدالله )ی کوڕی(رواحە) ئاڵاکە هەڵگرێ، شایانی باسە لەنێو سوپادا ئەسپ سوارێکی بوێرو ئازا هەبوو کەئەویش (خالد)ی کوڕی(ولید)بوو کە بۆ یەکەم جار بەشداری جەنگی دەکرد کاتێك سوپا ئامادەبوو پێغەمبەر(ﷺ)چەند ئامۆژگاریەکی بەنرخی کردن و فەرمووی: بەناوی خواوە جەنگ دژی دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتان بکەن، کەسانێك دەبینن، خەریکی خواپەرستین ئازاریان مەدەن ، ئافرەت و منداڵ مەکوژن، گیاندار مەکوژن و درەخت مەبڕن، خانوو

مەڕوخێنن. جا کە گەیشتنە ئەوێ لەشکری دوژمن بەنزیکەی دووسەد هەزار مەزندە دەکرا چونکە ژمارەیەکی زۆری عەرەبە گاورەکانیش پەیوەست بووبوون بەڕۆمەکانەوە هەندێك لەموسڵمانان ترس و دڵەڕاوکێ ڕووی تێکردن بۆیە (عبدالله)ی کوڕی(رواحه) هەڵساو وتی: خەڵکینە ئەو شەهیدیەی ئێمە ئاواتمانەو هەر بۆ ئەومەبەستەیش هاتووین، جێگەی سەرسوڕمانە ئێستە لێی دوو دڵ بین!! سوێند بەخوا ئێمە بەزۆری ژمارەو زۆری چەك و زۆری ئەسپ نەجەنگاوین، بەڵکو بەم ئایینەوە جەنگاوین کە خوای گەورە بەهۆیەوە ڕێزداری کردووین، کە ئاکامەکەی یەکێکە لە دوو دەرەنجامە چاکەکە: یان سەرکەوتنە یان شەهید بوونە.

جەنگەکە دەستی پێکردو (زید)کوڕی(حارثة)بەئالاکەی پێغەمبەری خواوە ڕیزەکانی دوژمنی بڕی هەتا شەهیدکرا، ئینجا (جعفر)ی کوڕی(أبو طالب) ئالاکەی هەڵگرتەوەو جەنگی کرد، تا باڵی ڕاستی قرتا، ئینجا بەدەستی چەپی ئالاکەی هەڵگرتەوە باڵی چەپیشی قرتا، پاشان بەڕانەکانی ئالاکەی گرت هەتا شەهید کرا، لەنەوەد شوێنەوە جێگەی شیروتیر بەجەستەیەوە بوو، دوای ئەو (عبدالله)ی‌کوڕی(رواحه) ئالاکەی گرتە دەست و زۆر ئازایانە ڕۆیشتە ناو گۆڕەپانی جەنگەوە بەجۆرێك خۆی بیرچوبوەوە کە لەجەنگ و کوشتاردایە تا شەهید کرا، ئەوسا (مجاهدان) کۆبوونەوە لەسەر ئالاکەو دایان بە(خالد)ی کوڕی (ولید) ئەویش هەتا ئێوارە بەشەکاوەیی بەدەستیەوە مایەوە، کاتێك شەو داهات (خالد)جەنگاوەرانی کۆکردەوە تاسنورێك بۆ ئەم جەنگە دابنێن چونکە جیاوازی نێوان ژمارەیان زۆرەو تەنها ورەی بەرز نایانگەیەنێتە ئاکام، بۆیە لەم جەنگەدا بلیمەتی سەربازیانەی (خالد) دەرکەوت بەوەی پاشەکشێی سوپای موسڵمانانی بەبێ زیان مسۆگەر کرد بێ ئەوەی دوژمن وا هەست بکات کەپاشەکشێ دەکەن، ئەوەبوو لای ڕاستی سوپاکەی خستە ناوەڕاستەوەو



ناوەڕاستیشی خستە لای چەپ و لای چەپیشی خستە لای ڕاست، پاشان فەرمانیدا بەچەند سوارێك کە بەهۆی ئەسپەکانیانەوە لەدوورەوە تەپوتۆزی زۆر ناوبەناو بەرپا بکەن، تا دوژمن وابزانێت کە کۆمەکیان بۆ دێت، تا دووچاری ترس و دڵەڕاوکێ بن ..

پاشان زۆر بەخێرایی (خالد) توانی پاشەکشێ بەسوپاکەی بکات و خۆیان بدەنە پاڵ (مؤتە) پاشان لەوێوە بۆماوەی(٧)ڕۆژ جەنگێکی پارتیزانانەی لەگەڵدا کردن، بەجۆرێك دوژمن وایدەزانی (خالد) دەیەوێت سوپاکەیان بەرەو بیابان کێش بکات ئەوسا ئیتر لەشکری ڕۆم و هاوکارانی کۆڵیانداو بوو بە سەرکەوتن بۆ موسڵمانان و گەڕانەوە بۆ مەدینە، کەچی هەندێ لە موسڵمانان تانەو تەشەریان لێدان و پێیان دەوتن هەڵاتوەکان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی، نا بەڵکو هێرشبەرانی بەردەوام دەبن، هەروەها ستایشی (خالد)ی کرد لەسەر لێهاتوویی‌و ئەونەخشەیەی کەسوپاکەی پێ ڕزگارکرد .

**غەزای (خیبر) :**

(خیبر) شارێکی گەورەیەو بەچەندین قەڵاو کێڵگە دەورەدراوە، ٦٠کم لەباکوری (مدینە)وەیە، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیابوو لەشەڕی دوژمنانی تری، بڕیاریدا جولەکەو هۆزەکانی (نجد )تەمێ بکات، هەتا ئاشتی‌و ئاسایش بەرقەراربێت و خەڵکی ئازاد بن بەتایبەت چونکە (خیبر) هێلانەی پیلان ودژایەتی کردنی بەردەوام بوو، ناوەندێك بوو بۆ خیانەت و هەڵگیرساندنی جەنگ، لەبەرئەوە ئازادکردنی شارەکە گرنگیەکی زۆری هەبوو هەربۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دوای گەڕانەوەی لە (حدیبیە)و پشودانێکی چەند حەفتەیی، لە(مەدینە)دا بڕیاریدا بەرەو (خیبر) بڕوات و فەرمووی: کەس نەیەت جگە لەوانەی کە تامەزرۆی



(جهاد)ن ... بەومەرجانەی کەخواو پێغەمبەرەکەی لایان پەسەندە.. هەر بۆیە تەنها ئەو ١٤٠٠کەسە لەخزمەتیدا ڕۆیشتن کە لە ژێر درەختی (رضوان)دا پەیمانیان پێدا .

پێغەمبەر(ﷺ) لەکێوی (عصر)ەوە بەرەو (صهباء)ڕۆیشت، پاشان لەدۆڵی (رجیع)ەوە دابەزی، هۆزی(غطفان)شەوو ڕۆژێك دووربوون،(غطفان)یش لەڕێگەی خۆیانەوە بە سوپاکەی پێغەمبەریان زانی، بۆیە ئەوانیش کەوتنە خۆیان و هاتن بەرەو (خیبر) بۆ کۆمەکی جولەکە!! کاتێك لەڕێگەدا بوون، هەستیان بەجۆرێك لە ترس و بیم کردو وایانزانی کەموسڵمانان لەلایەکی ترەوە هێرشیان کردۆتە سەر هەوارگەکەیان، بۆیە خێرا گەڕانەوەو وازیان لەکۆمەکی کردنی جولەکە هێنا.

پێغەمبەر(ﷺ) گەمارۆی (خیبر)ی‌دا، کە لەدوو بەش پێك هاتبوو، بەشێکیان (٥)قەڵابوو، بەشەکەی تریان (٣) قەڵا.

یەکەم قەڵا کەموسڵمانان هێرشیان بۆ برد قەڵای (ناعم) بوو، کەبە هێڵی بەرگری یەکەمی جولەکە دادەنرا، بەسەرکردایەتی (علی) کوڕی (أبوطالب).

سەرەتا بانگیان کردن بۆ ئیسلام، بەڵام ڕازی نەبوون و شاڵاویان هێناو جەنگێکی سەخت بەرپا بوو، لەئاکامدا جولەکە شکستی هێنا پاشان لەشکری موسڵمانان سەریان کرد بەقەڵای (صعب)دا کە دووەم قەڵایە لەوێشەوە سەریان کێشا بۆ قەڵای(ناعم)بەسەرکردایەتی (حباب)ی‌کوڕی(منذر)و دوای سێ ڕۆژ گەمارۆ ئەو قەڵایەشیان ئازاد کرد، سەرەنجام هەموویان ڕزگار کران..

دوای ئەو جەنگە پێغەمبەر(ﷺ)گەڕایەوە بۆ (مەدینە)، ئەو شەوە بەڕێگاوە بوون لە دواساتەکانی شەودا خەو زۆری بۆهێنان و بەبیلالی فەرموو: کەمێك دەخەوین، دیارە(بیلال)یش ماندوو بوو بۆیە بۆ نوێژی بەیانی کەس بەئاگا

نەهاتەوە هەتا خۆر تینی بۆ هێنان، جا یەکەم کەس کەبەئاگاهاتەوە پێغەمبەربوو(ﷺ)پاشان هەموویان هەستان و نوێژی بەیانیان گێرایەوە .

## ۞ ڕزگارکردنی مەککە :

لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا، پەیتا پەیتا تیرەو هۆزەکان لەدوای پەیمانی (حدیبیە) دەهاتنە نێو بازنەی ئیسلامەوە، یەکێك لەو هۆزانە هۆزی(دوس) بوو بەسەرۆکایەتی (طفیل)ی شاعیر، هەروەها هۆزی (غفار)کە هۆزی(ابو ذر الغفاری) بوو، جگە لەهۆزی(بنی سلیم)، ئەوەبوو هۆزی (الخزاعە) یەکسەر دوای پەیمانی (حدیبیە)بوونە هاوپەیمانی پێغەمبەر(ﷺ)، هۆزی(بنی بکر)یش بوونە هاوپەیمانیقورەیش، هەردوو هۆز جەنگێکی درێژ خایەن لەنێوانیاندا ڕویدا بوو، بەو هاوپەیمانیە جەنگی نێوانیان وەستا. هۆزی (خزاعە) کەوتنە ئەنجامدانی (عمرە) لەورۆژەدا (نوفل)ی کوڕی (معاویە) دوای ئەوەی مۆڵەتی لەقورەیش وەرگرتبوو بۆ کوشتنی چەند کەسێکیان، لەناکاوهێرشی کردە سەریان سێ کەسی لێ سەربڕین!!

ئەوسا یەکێك لە(خزاعیە)کان کەناوی (عمرو)ی کوڕی(سالم) بوو بەخێرایی مەککەی بەجێهێشت و نەوەستا هەتا خۆی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ)، لەبەردەمیدا وەستا. لەکاتێکدا کە لەمزگەوت لەناو خەڵکیدا بوو .

ئەم شیعرانەی وت :

| | |
|---|---|
| يارب إني ناشد محمداً | حلفنا وحلف أبيه الأتلدا |
| قد كنتم ولداً وكنا والداً | ثم أسلمنا ولم تنزع يداً |

واتە:

پەروەردگارا من ڕووبە (محمد) دەڵێم



که هاوپەیمانی خۆیو باوانی ڕێزداری ئەوین

کاتی خۆی ئێوە کوڕمان بوون وئێمە لەجێی باوك بووین

پاشان دریغیمان نەکردو موسڵمان بووین

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئەی (عمرو)ی کوڕی (سالم) پشتت دەگیرێت، پاشان پەڵە هەورێکی بەئاسمانەوە بینی و فەرمووی: ئەو هەورانە مژدەی سەرکەوتنی (بنی کعب) نیشان دەدەن .

بەوشێوەیە پەیمانەکەی (حدیبیە) لەلایەن قوڕەیشیەکانەوە هەڵوەشێنرایەوە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) مەککە بەبێ جەنگ رزگاربکات،سەرانی قوڕەیش لە(دار الندوة) کۆبونەوەو( ابو سفیان) بەشداربوو، یەکێکیان لەگەڵدا بوو ناوی (عبدالله)ی کوڕی(سعد)بوو چەند پێشنیارێکی بۆ کردن: یەکەم: خوێنباییدان، دووهەمیان: بەدەستەوەدانی بکوژەکان، سێهەمیان: خۆ ئامادەکرن بۆ جەنگ.

(أبو سفیان) پێشنیاری کرد کە ڕێکەوتننامەیەکی نوێ ئەنجام بدەن هەر بۆیە بەرەو (مەدینە) کەوتە ڕێو چووە ماڵی (أم حبیبة )ی کچی کەهاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، لەوکاتەدا لەماڵ نەبوو هەر کەهاتەوە بینی باوکی لەسەر جێگاکەی پێغەمبەر(ﷺ)دانیشتووە.

بیئەوەی بەخێر هاتنی بکات جێگاکەی لە ژێر باوکی ڕاکێشا، ئەویش وتی: کچی خۆم ئەو جێگەیەم پێ ڕەوا نابینی؟! وتی: ئەوە جێگەی پێغەمبەری خوایە، تۆیش کابرایەکی پۆخلێت!! (ابوسفیان) وتی: دوای من خراپت بەسەر هاتووە(أم حبیبة) وتی: نە(والله) لەو ڕۆژەوە پێغەمبەرم(ﷺ) ناسیوە خێرنەبێ هیچیترم نەهاتوەتەڕێ .

ئیتر (أبو سفیان) هەڵساو چوو بۆ مزگەوت و لەبەردەمی موسڵمانانندا وەستاو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی (محمد) من بەشداری پەیمانی (حدیبیە)م نەکردوە بەپەیماننامەیەکی خێریشمان زانیوە بۆیە هاتووم تا پەیمانەکە پتەوتر بکەین و ماوەکەی درێژتر بکەینەوە، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: (أبو سفیان) هەر بۆئەوە هاتوویت؟! وتی: بەڵێ، فەمووی: هیچ شتێك قەوماوە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی نەدایەوە، ئەوسا هەڵساو چووە لای (ابو بکر) وئەویش فەرمووی: ئێمە لەسەر پەیمانی خۆمانین نەزیادی دەکەین و نەدەیگۆڕین و نەخیانەت لەوانەدەکەین کە لەپەنای پێغەمبەری خواداان، لای ئەویش هەڵساو چوو بۆ لای (عمر)و وتی: حەز لەسەرفرازی بەردەوام ناکەیت؟!(عمر) فەرمووی: چی‌یە؟ وتی: ئەم داوایەم بەناو خەڵکیدا بڵاوبکەرەوە، (عمر) وتی: کەست دەست نەکەوتوە من نەبێت؟ (واللە) بەقەد مێرولەیەك بیانوم دەست بکەوتایە بەهۆیەوە جەنگم لەدژتان بەرپا دەکرد، بەداخەوە پەیمانێك لەنێوانماندا هەیە، هەموو ڕۆژێك داوا لەخوا دەکەم ئەگەر ڕێکەوتن نامەکە پتەوە هەڵی بوەشێنێت، ئینجا (أبو سفیان) چوو بۆلای (عثمان )و ئەویش هەر وتی: پەنای من لەپەنای پێغەمبەری خوادایە، ئینجا چووە لای (علی)و پێی وت: تۆ نزیکترین کەسی لە ڕووی خزمایەتیەوە، دەتوانی ئەم کارەم بۆ بکەیت؟! ئەویش وتی: پەنای من پەنای پێغەمبەری خوایە(ﷺ) ئینجا بەخاتو (فاطمة)ی وت: دەتوانیت پەنای ئەو خەڵکە بدەیت؟! ئەویش وتی: من ئافرەتم و پەنادان کاری من نیە، بەڵکو کاری پیاوانە، پاشان گەڕایەوە ناو مزگەوت و لەناوەڕاستیدا وەستاو وتی: من (أبو سفیان)م من گەورەی قوڕەیشم من پەنای خەڵك دەدەم، پێغەمبەر(ﷺ) سەیرێکی کردوو فەرمووی: ئەوە قسەی خۆتە!! دوای ئەوە



پێغەمبەر(ﷺ)ڕۆیشتە لای خاتوو (عائشە) و فەرمووی: کەل و پەلی جەنگم بۆ ئامادەبکەو با ئەم نهێنیيەشت لابێت (عائشە) فەرمووی: چیيە (یارسول الله) فەرمووی: بەیانی بەرەو مەککە دەچین.

دوای تاوێك باوکی هاتە ژوورەوەو بەخاتوو (عائشە) ی وت: وادیارە کەل و پەلی جەنگ بۆ پێغەمبەر(ﷺ)ئامادە دەکەیت؟! وتی: بەڵێ،وتی بۆچی دەیەوێت جەنگ بکات؟! فەرمووی: بەڵێ، (أبوبکر) لەبەرخۆیەوە وتی: ڕەنگە بۆ سەر ڕۆمەکان بچێت ؟! خاتوو (عائشە) زەردەخەنەیەکی کردو وەڵامی نەدایەوە، فەرمووی: ئەی ناچێتە سەر (هوازن)؟! ئەم جارەش زەردەخەنەیەکی کردو وەڵامی نەدایەوە. پاشان سەیرێکی خاتوو (عائشە)ی کردو فەرمووی: وادیارە دەیەوێت بچێتە سەر قورەیش دیسانەوە خاتوو(عائشە) زەردەخەنەیەکی کردو وەڵامی نەدایەوە ، باوکی جێ هێشت ..

(ابوبکر)یشماڵەکەی جێهێشت و ڕۆیشت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خۆتان بۆ جەنگ ئامادەبکەن ، وتیان: بۆ کوێ بڕۆین (یارسول الله)؟ فەرموی دوایی دەزانن.

ئینجا پشتیوانان بەرگی جەنگیان پۆشی .پێغەمبەر(ﷺ)چەند نامەیەکی ئاڕاستەی تیرەو هۆزە موسڵمانەکان کردو داوای لێ کردن خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ هەمووشیان پرسیاریان دەکرد بۆکوێ دەڕۆین (یارسول الله)؟ ئەویش دەیفەرموو: دوایی دەزانن . پێغەمبەر(ﷺ)هاتە دەرو بانگی (ابوبکر)و(عمر)ی کردو زۆر گفتوگۆی لەگەڵدا کردن، پاشان٨تاقمی بۆ چاودێری ڕەوانە کرد، (طلحة)ی کوڕی(عبیدالله)ی کردە سەرکردەیان وپێی فەرموون: بڕۆن بەرەو ڕێگای (هوازن)،(سعید)ی کوڕی(زید)یشی لەگەڵدا بوو پێی فەرموو: بڕۆ هەواڵی (هوازن)م بۆبێنە، هەواڵ لەناو مەدینەدا بڵاوبوەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)



دەیەوێت هێرش بکاتە سەر (هوازن)، ئینجا کەوتە بانگ کردنی تیرەو هۆزەکان، هەر هۆزێك کە دەهاتن نزای خێری بۆ دەکردن، هۆزی (أسلم)هات و پێی فەرموون: (أسلم)هات خوا سەلامەتی بکات،پاشان هۆزی (غفار)یش هات و پێی فەرموون : (غفار) خوا لێی خۆش بێت .

لەوکاتانەدا هاوەڵێك بەناوی (حاطب)ی کوڕی (ابو بلتعه)نامەیەکی نوسی و بەئافرەتێکدا ناردی بۆ قورەیش، بەڵام خوای گەورە ئەو نهێنیەی ئاشکرا کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەبوو (زبیر)و (علی) نارد تا خۆیان بگەیەننە ئەو ئافرەتە، کاتێك گەیشتنە لای فەرمانیان پێکرد نامەکەیان پێ‌بدات، ئافرەتەکە سوێندی خواردو نکوڵی لێ‌کرد بەڵام ئەوان هەڕەشەیان لێکرد، سەرەنجام نامەکەی دایە دەستیان و ئافرەتەکەیان گێڕایەوە بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بەکۆکردنەوەی موسڵمانان لەمزگەوت دا، (حاطب)یش لەوێ بوو، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی کرد بە(علی) نامەکە بۆ موسڵمانان بخوێنێتەوە نوسرابوو: لە(حاطب)ەوە بۆ(أبو سفیان) گەورەی قورەیش، پێغەمبەری خوا خۆی ئامادەکردووە بۆ جەنگ دژی ئێوە، ئێوەیش خۆتان ئامادەبکەن .

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی (حاطب)ئەمەچییە،(حاطب) وتی: (یارسول الله) پەلەم لێ مەکە، من کەسوکارم لەناو قورەیشدا ماوون تائەمڕۆیش ماڵ و منداڵم لەناو مەککەدان، ویستم بە هۆی ئەو نامەیەوە چاکەیەکم هەبێت لەگەڵیان تا ماڵ ومنداڵەکەم لەشەڕیان بەدوور بێت، (عمر) شمشێرەکەی دەرهێناو فەرمووی: (یارسول الله) ڕێگەم بدە لەگەردنی ئەم دووڕووە بدەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (عمر) لەوانەیە خوای گەورە سەیری بەشدارانی



غەزای بەدری کردبێت و فەرمویێتی: چی دەکەن بیکەن، من لەهەموو گوناهەکانتان خۆش بووم. ئینجا (عمر) گریاو لەو هەڵوێستەی پەشیمان بوەوەو فەرمووی: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن .

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)گەمارۆی خستە سەر (مەدینە)و بەبێ مۆڵەتی خۆی رێگەی نەدا کەس بڕواتە دەر لە شار بەڵام هاتنە ناوشار رێگە پێدراو بوو.

سوپا دەستی کرد بە جوڵە ژمارەیان (١٠) هەزار جەنگاوەر بوو (٣) هەزاریان ئەسپ سوار بوون بەرەو (هوازن) کەوتنەرێ ،(هوازن)یش خۆیان ئامادەکرد، (خالد)ی کوڕی(ولید) لەلای ڕاست و لەپێشەوەی سوپاکەدا بوو ، (أبوعبیدة) لەلای چەپەوە، (زبیر)ی کوڕی(عوام)یش لەناوەڕاستەوە بوو، ئاڵاهەڵگری کۆچبەران و پشتیوانان(سعد)ی کوڕی(عبادە)بوو، پێش گەیشتنیان بە (هوازن ) بە ٨کم پێغەمبەر(ﷺ)ئاڕاستەی سوپاکەی بەخێرایی بەرەو مەککە گۆڕی، چاودێرەکان (طلحة)و(سعید)ی کوڕی(زید)یان نارد بۆ پاك کردنەوەی رێگا لە سیخوڕەکان ..

(هوازن)بەتەواوی لەهەواڵ دابڕان بەهۆی گیرانی سیخوڕەکانیانەوە، ئەوسا نزیکی شاری مەککەبوونەوەو تەنها ٤میلیان مابوو، بڕیاردرا لەوێدا سەربازەکان چادر هەڵدەن و تێکڕا لەشەودا ئاگرێکی زۆر بکەنەوە ، لەم ساتە وەختەدا (عباس)ی مامی پێغەمبەر هات و موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ)بە موسڵمان بوونی خۆشحاڵ بوو، (عباس) بەپێغەمبەری وت: مەیەرە ناو مەککەوە هەتا ئەگەڕێمەوە بەڵکو موسڵمان بن ، ئینجا وتی : (یارسول الله) شتێکم بدەرێ وەك ئەمانەتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەمە ئێسترەکەمە ببە بۆ سواریی.

(أبوسفیان) هاتەدەر ئەو هەموو ئاگرە زۆرەی بینی، یەکێك لەهاوەڵانی وتی: لەوانەیە ئەمانە (هوازن) بن ، وتی: (هوازن ) لەوە کەمترن بتوانن دیمەنی ئاوەها

بنوێنن، کابرا وتی دەی لەوانەیە خزاعە بێ، (أبو سفيان) وتی: نەخێر(خزاعە)ش لەوەکەمتڕو بێ هێزترن، کاتێك سەیری کرد (عباس) مامی پێغەمبەر(ﷺ)هات و پێی وت: ئەوە موسڵمان بووی،(عباس)وتی: (ابوسفيان ) پێغەمبەری خوا ١٠هەزار جەنگاوەری پڕ چەکەوە گەمارۆی مەککەیان داوەو هەموو عەرەبی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، لەبەرئەوە ئێستا چارە لەدەستی تۆدایە ، ئەگەر بەزۆر ڕزگاری بکات ئەوا قوڕەیش تیا دەچێت، وەرە لەگەڵماو قوڕەیشی بدەرەدەست، وتی : بەڵێ بەڵام ئەترسم بمکوژێت، (عباس) وتی مەترسە ئەگەر چویتە ژوورەوە بۆلای وەکو براکانی یوسف بلێ ﴿قَالُواْ تَاللّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾ ئینجا پێی وت: وەرە لەپشتمەوە سواربە لەسەر هێسترەکەی پێغەمبەر(ﷺ)هەتا سەلامەتیت بپارێزم، ئەوەبوو هاتنە ناو سەربازگەی موسڵمانانەوە، سەرۆکی پاسەوانان (عمر) بوو، (أبو سفيان ) لەترسا وتی: خوا سەلامەتت بکات !!

بەڵام (عمر) فەرمووی: ئەی خیانەتکار بەبێ پەیمان و پەنادان گەردنتم بدەرێ با لەتی بکەم ، (عباس)وتی: (عمر)،(أبوسفيان) لەپەنای منداية، (عمر) وتی: ئەمڕۆ پەنادان نیە ، (عباس) وتی: (عمر) هەرلەبەرئەوەی (أبوسفيان) لە (بنی عبدالمناف)ە ئاوا لێی بەداخیت!! ئەی ئەگەر لە (بنی عدی ) بوایە بڕواناکەم ئاوا توڕە بویتایە!! (عمر) بەم قسەیەی (عباس) غەمبار بوو وتی : (والله) (عباس) پێش کەمێك موسڵمان بونتم زانی مەگەر بە موسڵمان بونی (خطابی) باوکم ئەوەندە خۆش حاڵ بومایە .

دەشزانم کە پێغەمبەر(ﷺ)خۆشحاڵتردەبێت بەموسڵمان بونت وەك لەموسڵمان بونی باوکم، ئەوسا چوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)کاتێك

(أبوسفیان) بینی ڕوخساری سور هەڵگەڕاو فەرمووی:(أبوسفیان) ئێوە خیانەتان کرد، (أبوسفیان ) وتی: بەڕاستی خوای گەورە ڕێزو باوی تۆیدا بەسەر ئێمەدا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کەواتە هیچ غەمتان نەبێت ئەمڕۆ ئێوە لۆمەو سەرزەنشت ناکرێن خوا لێتان خۆش بێت.. (عباس) وتی: ئەی (أبوسفیان) ئادەی مەککە تسلیم بکە یت!!...

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئێستە شایەتی دەدەیت کە هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله)، (أبوسفیان) وتی: بەڕاستی بەئارام و خۆگربوویت، (عباس)وتی: خوا بتگرێت، موسڵمان بەو شایەتمان بێنە!! ئەویش شایەتمانی هێنا، (عباس) وتی: یارسول الله (ابوسفیان ) پیاوێکە حەزی لەشانازی کردنە، ڕێزێکی بۆ دابنێ!! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ: هەرکەسێ بچێتە ماڵی (أبو سفیان) سەلامەت دەبێت، هەر کەسێکیش بڕواتە (بیت الحرام)ەوە بێ وەی دەبێت هەرکەسێکیش دەرگای ماڵی دابخات هەر بێوەی دەبێت.

ئەوسا پێغەمبەر(ﷺ)وەك ڕزگارکارێکی سەرکەوتوو هاتە نێو مەککەوە بەدەم کڕنوشەوە بێ ئەوەی دڵۆپە خوێنێك بڕژێت، پاشان ڕۆیشتە سەر بەرزایی (صفا) دوای ئەوەی خەڵکەکەی کۆکردەوە. فەرمووی: ئەی خەڵکی قورەیش ئێوە پێتان وایە چیتان لێ دەکەم؟ وتیان: هەر خێر لەتۆ دەوەشێتەوە، تۆ هەمیشە براو برازایەکی چاك بوویت.

فەرمووی: منیش هەر فەرمایشتەکەی یوسف دووبارە دەکەمەوە کە بەبراکانی فەرموو ئەمڕۆ لۆمەو سەرزەنشتتان ناکەم بڕۆن هەمووتان ئازادن!!

**جەنگی (حنین) :**

لەدوای ڕزگارکردنی مەککە پێغەمبەر(ﷺ)١٩ڕۆژ لە خێمەیەکدا مایەوە، لەمانگی (شەوال)ی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا، بە١٢ هەزار جەنگاوەرەوە کە(١٠)هەزاریان ئەوانەبوون لەڕزگارکردنی مەککەدا لەخزمەتیدا هاتبوون.

دووهەزاریشیان نۆ موسڵمانی مەککەیی بوون، پێغەمبەر(ﷺ)(١٠٠) قەڵغانی بەشمەکەکانیەوە بە ئامانەت لە (صفوان) وەرگرت و (عتاب)ی کوڕی(أسید)ی کردە بەرپرسی( مەککە).

سوپا گەیشتە (حنین)،(مالك)ی کوڕی(عوف) بەشەو سوپاکەی لەو شیوەدا ئامادەکردبوو، چەند بۆسەیەکیشی لەسەر ڕێگاو دەروازەو شیوو دۆڵەکاندا دانابوو فەرمانی پێکردبوون کە هەرموسڵمانان دەرکەوتن هەموو پێکەوە هێرش بکەن !!

لەبەرەبەیاندا موسڵمانان بەشیوەکەدا هاتنە خوارەوە بێئەوەیبزانن کە چەندین بۆسەیان بۆ دانراوە ، لەناکاو تیر باران و ڕمباران کران و هێرشی سوپای دوژمن دەستی پێکرد، موسڵمانان شپرزە بوون، بەتایبەت نۆموسڵمانەکان هەڵاتن !!

پێغەمبەر(ﷺ)لای ڕاستی گرت و فەرمووی: خەڵکینە وەرنە لای من، من پێغەمبەری خوام ، من(محمد)ی کوڕی (عبدالله)م ، بێگومان ئازایەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئالەوێدا زۆر ئاشکرا بوو، بەسەر ئێسترەکەیەوە هاتە نێو دوژمن و ئەیفەرموو: منم پێغەمبەرم بێدرۆ من کوڕی(عبدالمطلب)م، پاشان دابەزیو کەوتە پاڕانەوە لەخوای گەورەو فەرمووی: پەروەردگارا سەرکەوتنی خۆتمان پێ ببەخشە .

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە (عباس)ی مامی کە بانگی هاوەڵان بکات، ئەوسا دوای ماوەیەك تیپ لەدوای تیپ موسڵمانان بەدوای‌یەکدا لەدەوری پێغەمبەر(ﷺ)کۆبونەوە، جەنگێکی زۆر توند وسەخت بەرپا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) سەیرێکی گۆرەپانی جەنگی کردو فەرمووی ئێستا کاتی هەڵمەت و توندوتیژییە، پاشان مشتێك خۆڵی لەسەر زەویەکە هەڵگرت و کردی بەڕوخساری دوژمناندا و فەرمووی: کوێر بێت ڕوخسارتان، ئیتر هەموو چاویان پڕ بوو لە خۆڵ و دوای چەند سەعاتێکی کەم دوژمن زۆر بەخراپی تێك شکاو (ثقیف)٧٠کەسیان لێ کوژراو دەسکەوتێکی زۆری جەنگی کەوتە دەستی موسڵمانان، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)دەسکەوتەکانی جەنگی بەدەستێکی کراوەوە بەخشیە قورەیش و نۆموسڵمانان، بەشی پشتیوانانی نەدا، شتێك لەدڵ و دەرونیاندا دروست بوو، هەندێکیان وتیان: پێغەمبەر(ﷺ)هاتەوە ناو خزمانی خۆیو ئێمەی لەبیرکرد، هەر بۆیە (سعد)ی کوڕی(عبادة) ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)وتی: (یارسول الله) بەهۆی دابەشکردنی دەستکەوتەکانەوە کەبەسەر قورەیش و خەڵکیدا دابەشت کردو بەشی پشتیوانانت نەدا، شتێك لەدڵ و دەرونیاندا دروستبووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی تۆ دەڵێی چی؟(سعد)وتی: منیش هەروا بیردەکەمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بڕۆ هەموویانم بۆ کۆ بکەرەوە، کاتێ کۆبونەوە ... پێغەمبەر(ﷺ)چووبۆ لایان، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو پاشان فەرمووی: ئەی برایانی پشتیوان، شتێکم بیستووەو لەوەدەچێت شتێك لەدڵ و دەرونتاندا بەرانبەرم دروست بووبێت!!؟ باشە، ئایا ئێوە گومڕا نەبوون، بەهاتنی من خوای گەورە هیدایەتیدان؟! هەژار نەبوون خوا دەوڵەمەندی کردن؟! دوژمنی یەکتر نەبوون



خوای گەورە کردنیە دۆست و برای یەکتر؟! هەموو وتیان: بەڵێ، وایەو هەمووی بەفەزڵ و میهری خواو پێغەمبەرەکەیەتی.

پاشان فەرمووی: برایانی پشتیوان ئەوە بۆ وەڵام نادەنەوە؟ وتیان وەڵامی چیت بدەینەوە (یارسول الله)؟ هەمووی وایەو فەزڵ و میهری خواو پێغەمبەرەکەیەتی، کەچی فەرمووی: بەڵام (والله) دەتانتوانی بڵێن و ڕاستیشتان دەکردو بڕواشتان پێ دەکرا : کاتێك هاتیتە لامان خزمانی خۆت بڕوایان پێ نەدەکردیت، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێکردیت، بێ‌پشتیوان بوویت، پشتمان گرتیت، دەرکراو بوویت، پەنامان دایت، غەمبارو نەدارو نیگەران بویت، دڵنەوایی‌و دڵخۆشمان کردیت ... باشە شتێکی بێ نرخ کە بەخشیم بە خەڵکانێك تا دل دامەزراوو دڵخۆش بن، ئێوەشم دایە دەست ئیمان و باوەڕەکەتان کەچی ئاوا نیگەران بوون؟ ئەی برا پشتیوانەکان: ئایا ئێوە ڕازی نابن خەڵکی بەمەڕو وشترەوە بگەڕێنەوە، بەڵام ئێوە بە(رسول الله)ەوە بگەڕێنەوە؟! سوێندم بەو کەسەی گیانی (محمد)ی بەدەستە، ئەگەر کۆچ نەبوایە یەکێك دەبووم لەپشتیوانان، ئەگەر خەڵکی ڕێگایەکیان بگرتایەتەبەرو پشتیوانانیش ڕێگایەکی تر، من هەر ڕێگای پشتیوانانم دەگرتە بەر، خوایە ڕەحم ومیهری خۆت بڕێژە بەسەر پشتیوانان و نەوەکانیان و نەوەی نەوەکانیاندا.

ئەوسا هەموویان دەستیان کرد بەگریانێکی بەکوڵ هەتا ڕیشیان بەتەواوی تەڕ بوو پاشان ووتیان، ڕازین بە(رسول الله)، ڕازین کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)بەش و نسیبمان بێت پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ)هەڵساو ئەوانیش بڵاوەیان لێ کرد .



### جەنگی تەبوك :

هەواڵێك گەیشت بەپێغەمبەری خوا(ﷺ)گوایە رۆم سوپایەكی كۆكردوەتەوەو دەیەوێت (مدینە) داگیربكات، ئەمەش لەساڵێكی گرانیو كەمدەستیدا بوو، بێگومان لەوكاتانەدا بەخشندەییو نان بدەیی لەرێی خوادا بەتەواوی دەردەكەوێت، پێغەمبەر(ﷺ)ئاگاداری هاوەڵانی كرد لەئامانجەكەیان، بۆ ئەوەی بەرچاو روون بن باسی درێژی رێگاو هێزی دوژمنەكەیانی بۆ كردن، بۆیە فەرمانیدا بەتەواوی خۆیانی بۆ ئامادەبكەن، هەروەها نامەی نارد بۆمەككەو تیرەو هۆزەكانی تری عەرەب و داوای بەشداریكردنی ئەو جەنگەی لێكردن فەرمانی بەدەوڵەمەندەكانیاندا كۆمەكی ئەوخۆبەخشانەبكەن كەدەیانەوێت بەشداری بكەن و هەژارن و هاوەڵانیش لەرێی خۆیانەوەگەیشتنە لوتكەی بەخشین و كۆمەك كردن بەوسوپایە، ئەوەبوو(عثمان)ی كوڕی(عفان) ١٠هەزار دینارو٣٠٠ وشتری بە هەموو پێداویستیەكانیەوە لەرێی خوادا بەسوپاكە بەخشی لەگەڵ ٥٠ ئەسپدا، پێغەمبەر(ﷺ)بەم بەخشینە رەنگی موبارەكی لەخۆشیدا ئاڵ و بریقەدار بوو بۆیە فەرمووی خوایە: من لە(عثمان) رازیم تۆیش لێی رازیبە، ئینجا (أبوبكر) هات و هەرچیەكی هەبوو بەخشی، پێغەمبەر(ﷺ)لێی پرسی: چیت هێشتۆتەوە بۆ ماڵ و منداڵت؟ فەرمووی: خواو پێغەمبەرەكەیم بۆ هێشتونەتەوە؟ دوای ئەو (عمر) هات و نیوەی ماڵەكەی بەخشیو پێغەمبەر(ﷺ) دوعای بەرەكەتداری بۆ هەردوكیان كردو پاشان فەرمووی: پلەو پایەتان لای خواو پێغەمبەرەكەی وەك ئاستی بەخشینەكەتانە، بەدوای ئەواندا هاوەڵانیش ئەوەی لەتوانایاندا بوو بەخشییان(عبدالرحمن)ی كوڕی(عوف) هات و ١٠٠مسقاڵ زێری بەخشی (عباس )و (طلحة)یش پارەیەكی زۆریان دانا،

(عاصم)ی کوڕی( عدی) ٧٠مەن خورمای بەخشی، ئافرەتانیش بازنەکانی دەستیان و گوارەی گوێیان و ملوانکەی ملیان دەخستە مشتیان و دەیانبرد، پێغەمبەریش(ﷺ)دوعای خێری بۆ دەکردن.

هەموان خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەو جەنگە، هەرچەندە بەخشینەکە زۆر بوو، بەڵام هێشتا بەشی ئەو ژمارە زۆرە لەخۆبەخشانی نەدەکرد بەتایبەتی چونکە ژمارەیەکیان هەژار بوون لەوانە٧کەسیان چوون بۆخزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) داوایان کرد کە توێشوی سەفەریان بۆ پەیدا بکات، ئەویش فەرمووی: هیچ شك نابەم بۆ گواستنەوەتان!! ئەوانیش بەچاوی پڕ لەئەسرینەوە ڕۆیشتن، بەڵام (عثمان)تەگبیری سیانیانی کرد (عباس)یش دوانیان و(یامین)ی کوڕی (عمر)یش دوانەکەی تریان، خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت.

ژمارەی سوپای موسڵمانان٣٠ هەزار جەنگاوەر بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) (محمد)ی کوڕی(مسلمة)ی کردەبەرپرسی (مدینە)و (علی)یشی دانا بۆ چاودێری خانەوادەکەی، بەڵام (علی) بەمە نیگەران بوو وتی:(یارسول الله) دەمکەیتە سەرپەرشتی ژن ومنداڵ!؟ پێغەمبەریش(ﷺ)بۆ ئەوەی دڵیبداتەوە فەرمووی: ئایا ڕازی نیت کەلەجێگەی هاروندا بیت بۆ من ومنیش لە جێگەی (موسی)دا بم بۆ تۆ، بەڵام ئەوەیە لەدوای من پێغەمبەر نابێت، لەم لایشەوە هەندێك لە دووڕوو باوەڕ لاوازان بەبیانوی جۆراوجۆرەوە خۆیان دزیەوە، کە دواتر قورئانی پیرۆز نیەتی دڵیانی ئاشکرا کرد کە خێریان تیدانیەو دوودڵی و گومان دەخەنە دڵی هاوەڵانەوە.

بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ)بەو سوپا بەهێزو زۆرەوە بەڕێکەوت کاتێك سوپا گەیشتە شوێنەواری (ثمود) پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: بەگریانەوە بەوێدا بڕۆن



چونکە ئەوەشوێنی ئەو کەسانەیە کەستەمیان لەخۆیان کرد، دیارە پێغەمبەر(ﷺ) ویستویەتی هەیبەت و ترسی خوا لەدڵیاندا زیندوو ڕابگیرێت، چونکە ئەو سزایە بۆیە داوێن گیریان بوو، باوەڕیان بەپێغەمبەرەکەیان نەکردو یاخی بوون ... کاتێك گەیشتنە سەر زەوی (تبوك) هیچ ئاوەدانیەکی تیا نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە(معاذ)ی کوڕی (جبل )ی فەرموو کەیەکێکە لەهاوەڵە زاناکان، ئەگەر تەمەنت درێژ بێت ئەوا ئەم چۆڵەوانیە دەبینیت پڕ دەبێت لە باخ و بێستانی گەورە... ، جا ئەوەبوو ژیا تا ئەو کەرامەتەی بینی ئەو ناوە هەموو بووە باخ و بێستان.

شایەنی باسە یەکێك لەهاوەڵان لەو جەنگە دواکەوت کە ناوی (ابو خیثمة) بوو کاتێ سوپا بەڕێکەوت ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو کەهاتەوە بۆماڵەوە سەیری کرد هەردوو ژنەکەی کەپری نێو باخەکەیان ڕازاندۆتەوەو ئاوڕشێنیان کردووەو ئاوی گۆزەی سازگاریان ئامادەکردووەو چێشتی خۆشیان لێناوە، لەدڵی خۆیدا وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەگەرما دابێت، منیش لەسێبەرو ئاوی سازگارو لەگەڵ ژنی شۆخدابم !!

ئینجا سوێندی خواردو وتی: (والله )نایەمە ژێر کەپرەکەتان و دەبێ خۆم بگەیەنم بە پێغەمبەر(ﷺ)ئیتر ناچار تێشوی سەفەریان بۆ ئامادەکرد، سواری ئەسپەکەی بو، شمشێرەکەی دابەشانیداو بەتەنیا کەوتەڕێ، پێغەمبەر(ﷺ)لە دورەوە بەدی کرد تەپ و تۆز دەوریدابو فەرمووی کن (أبا خیثمة)، دیارە ئەوەش کەرامەت و زیرەکی پێغەمبەری (ﷺ)دەرخست .

کاتێك سوپای موسڵمانان گەیشتە (تبوك)، ڕۆمەکان لەترسا پاشەکشەیان کرد چونکە هەواڵی هێزو توانای موسڵمانان و قوربانی دانیان بیست بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) بەپێویستی نەزانی شوێنیان بکەوێت، چونکە حەزی بە تۆڵەو خوێنڕێژی نەدەکرد، ئەوسا چەند ڕۆژێك لە(تبوك )مایەوە، لەو میانەیەدا چاوی



بەچەند نوێنەرێك كەوت و نامەی دۆستایەتی بۆ نوسین هەتا دڵنیا بن لـەسەلامەتی كاروانەكانیان، پاشان فەرمانیدا سوپا بەرەو (مدینه) بگەڕێنەوە، بەمەش سام و هەیبەتی موسڵمانان زیادیكرد، كاتێك گەیشتنەوە (مدینه) ئەوانەی شداری غەزاكەیان نەكرد هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)وپاكانەی خۆیان دەكردو ئەویش چاوپۆشی لێ دەكردن و داوای لێخۆشبونیشی بۆ دەكردن!! خوای گەورە لـەقورئاندا ئەو جۆرە كەسانەی بەدووروو ناوزەد فەرمووە، بەڵام سیان لـەهاوەڵان هاتن دانیان بەوەدانا كەهیچ بیانویەكیان نەبووە ئەوانیش: (كعب)ی كوڕی(مالك)و (مرارة)ی كوڕی(ربیع)و(هیلال)ی كوڕی(أمیة) بوون، (كعب) كاتێك ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)بەزەردەخەنەیەكی تایبەتەوە پێشوازی لێ كردو فەرمووی: چی دوای خستی؟! (كعب)وتی (یارسول الله) ئەگەر لـەگەڵ هەركەسێكی تردا بومایە لـە خەڵكی ئەم دنیایە بیانویەك خۆم لـەدەست توڕەبوونی ڕزگار دەكرد، خوای گەورە زمان و ڕەوان بێژییەكی چاكی پێبەخشیوم كەدەتوانم بەرامبەرەكەمی پێفریو بدەم بەڵام (والله) دەزانم ئەگەر ئەمڕۆ بیانویەك بهێنمەوەو خۆم لـە زویریو توڕەبوونی تۆ دەربازبكەم و ڕازیت بكەم خوای گەورە خەشم و قینی خۆی بەسەرما دەبارێنێت، خۆ ئەگەر ڕاستگۆبم لـەگەڵتان ئەوا لێم توڕە دەبیت، بەڵام داوای لێبوردن لـەخوای میهرەبان دەكەم. (والله) هیچ بیانویەكم نەبور كەدواكەوتووم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەمەیان ڕاستی وت، هەڵسە تاخوای گەورە دەربارەی تۆ فەرمانێك دەردەكات، هەروەها (مرارە)و(هلال)یش وەكو ئەو دانیان نابەگوناهەكەیاندا .

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا کەس قسەیان لەگەڵدا نەکات، هەروەها دەبێ لە خێزانەکانیشیان دابېڕێن بەڵام خێزانی هلال داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا کرد(ﷺ)تا خزمەتی مێردەکەی بکات چونکە پیاوێکی بەساڵاچووە .

کاتێك (کعب) ئەڕۆیشتە دەرەوە بۆمزگەوت سڵاوی لەپێغەمبەر(ﷺ)دەکرد نەیدەزانی ئاخۆ وەڵامی سڵاوەکەی دەداتەوە یان نا، ئەم دابڕانە ٥٠ ڕۆژی خایاند ئەم سیانە سەری دنیایان لێ هاتەوەیەك و هەستیان بە تەنگەبەرییەکی ناهەموار دەکرد، زەوی بەو بەرینیەی لەبەرچاویان تەواو تەنگەبەر بووبوو، لەدەرونی خۆیان بێزار بوون، هەتا خوای گەورە دەروی خێری لێ کردنەوەو تەوبەو پەشیمانیەکەیانی وەرگرت .

ئەوسا پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی نارد تا مژدەیان بداتێ کە خوای گەورە لێیان خۆش بووە، ئیتر خەڵکی پۆل پۆل پیرۆزبایی لێخۆشبونی خوایان لێ دەکردن. پێغەمبەر(ﷺ)زۆر بە شادمانیەوە پێشوازی لە(کعب) کردو پێی فەرموو: مژدەت لێ بێت ئەی (کعب) بەڕۆژێك کە خۆشترو چاکترت نەدیوە لەو ڕۆژەوە کە لەدایکت بوویت. (کعب) وتی: لای بەڕێزتانەوە یا لای خوای باڵادەستەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: بەڵکو لەلایەن خوای گەورەوە...

(کعب) هەستی بەشادیو کامەرانیەکی بێ وێنە کرد بەجۆرێك خەریك بوو دڵی لەسینەی دەهاتەدەر، ئینجا وتی: (یارسول الله) لە پاداشتی قبوڵ بوونی تەوبەکەم دەمەوێت هەرچی ماڵ و سامانم هەیە ببەخشم بەخوای گەورەو پێغەمبەرەکەی... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەندێکی بهێڵەرەوە باشترە بۆت.

### ۞ حەجیماڵئاوایی :

لەدوای ڕەمەزان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕایگەیاند دەیەوێت سەفەری حەج بکات، ئەوەبوو خەڵکێکی زۆر کۆبونەوە، لە(٢٤)ی (ذي القعدة)دا لە (مدينە)دەرچوو لە(ذي الحجة)دا خۆیو هاوەڵان (احرام)یان بەست، پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام سروتەکانی حەجی فێردەکردن، ژمارەی حاجیان گەیشتە ١١٤هەزار. پێغەمبەر(ﷺ) (علی) نارد تا ئاژەڵی قوربانی لەیەمەنەوە بهێنێت، ٦٣سەری لەگەڵ خۆیدا هێنا، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ حاجیاندا چونە ناو (البيت الحرام)ەوەو فەرمووی ((خوایە ڕێزو گەورەیی و شکۆمەندیو قەدری بەردەوام زیاد بکە ))، ٧جار بەدەوری (کعبە)دا (طواف)ی کرد، دەستی موبارەکیدا لەبەردە ڕەشەکەو پاشان دووڕکات نوێژی لە(مقام )ی (إبراهيم)دا ئەنجامداو دواتر لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە، پاشان لەنێوان (صفا)و(مروة)دا (٧) جار بەسواری وشترەکەیەوە ئەمسەرو ئەوسەری کرد، کاتێك بەرەو (صفا) سەردەکەوت دەیفەرموو (لاإله إلا الله،الله أكبر . لاإله إلا الله وحده، أنجز وعده و نصر عبده وهزم الأحزاب وحده) لە٨ی (ذي الحجة)دا بەرەو مینا تەشریفی بردو لەوێ مایەوە، لە ٩ی (ذي الحجة) دا بەرەو (عرفات) بەڕێکەوت دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆکردەوە، پاشان وتارێکی پیرۆزی پێشکەش کردو سەراپای ئاینی ئیسلامی بەبنەماو ڕێچکەکانیەوە بەکورتی خستە بەرچاوو، فەرمووی: خەڵکینە گوێ لەوتەکەم بگرن، من نازانم داخۆ دوای ئەم ساڵە لەم شوێنەدا پێتان دەگەمەوە یان نا، خەڵکینە هەمووتان لەئادەمن و ئادەمیش لە خاکە، عەرەب فەزڵ و ڕێزی نیە بەسەر غەیری عەرەبدا، غەیری عەرەبیش فەزڵی نیە بەسەر عەرەبدا بەتەقواو دینداریوخواناسی نەبێت...



هەمووتان وەکو دانەکانی شانە یەکسانن، خەڵکینە ئێوە دەزانن لەچ مانگێکدان؟ هاوەڵان، بێدەنگ بوون وایان زانی ناوێکی تری لێ دەنێت، فەرمووی: مەگەر لە مانگی (حرام) دانین ؟ وتیان: بەڵێ ، پاشان فەرمووی: خەڵکینە ئێوە دەزانن لەچ ناوچەیەکدان؟ هەموو بێدەنگ بوون وایان زانی خۆی ناوێکی تری لێدەنێت، فەرمووی: مەگەر ئێوە لەناوچەیەکی (حرام)دا دانین؟ وتیان: بەڵێ،ئینجا فەرمووی: دەی کەواتە خوێنتان و ماڵ وسامانتان لەیەکتری حەرامە، وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان و ئەم مانگەتان و ئەم ناوچەیەتان هەتا دەگەنەوە بەخوای خۆتان. ئینجا پرسی: ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ ئەوانیش بەڵێیان دەکرد، ئەویش دەیفەرموو: خوایە تۆ بەشایەت بە. هەرکەسێك ئەمانەتێکی لایە بابیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی هەموو سوخواردنێك حەرامە، بەڵام سەرمایەی خۆتان هی خۆتانە ستەم لە کەس مەکەن و مەیهێڵن ستەمتان لێبکرێت، خوای گەورە فەرمانی بە حەرامی سوخواردن داوە، سوی (عباس)کوڕی(عبدالمطلب)ی مامم کەکۆتایی هاتووە، یەکەم خوێنیش کەدەبێت کۆتایی بێت خوێنی (عامر)ی کوڕی (ربیعة)ی کوڕی(حارثة )، شانازیەکانی سەردەمی نەفامیش نابێت بمێنیێ، جگە لەزێوانیو ئاو بەخشین، کوشتنی بەئەنقەست حەق سەندنەوەی دروستە ئەوەش کەنیمچە ئەنقەستە وەك ئەوەی بەگۆچان و بەرد دەکوژێت خوێنباییەکەی دەبێ بدرێت کە ١٠٠ ووشترە، هەر کەسێ لەوەزیاتر وەربگرێت، ئەوە لەشتە ناباشەکانی سەردەمی نەفامیە .

خەڵکینە (شیطان) نائومێد بووە لەوەی لەمڕۆ بەدواوە گوێڕایەڵی بکرێت بەڵام لەشتی تردا، لەهەڵس و کەوت و کردەوە ناپەسەندەکاندا نائومێد نیە.



دەستکاری کردنی کاتەکان زیادە کوفرە، کافرەکان خەڵکی پێ گومڕا دەکەن و ساڵێك جەنگی تێدا (حلال) دەکەن و ساڵێکیش (حرام) ی دەکەن و ئەوەی خوای گەورە حەرامی کردووە پێشێلی دەکەن .

ڕۆژگاریش وەك شێوەی ئەو ڕۆژەی لێهاتوەتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی تیادا دروستکراون، ژمارەی مانگەکان لە(لوح المحفوظ)دا لای خوا هەر١٢مانگە ئەمەش هەر لەساتی دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوییەوە هەروا بووە،٤مانگیان لەمانگە حەرام کراوەکانە، سیانیان بەدوای‌یەکدا دێن : (ذوالقعد، ذوالحجة، محرم) چوارەمیشیان تەنهایە ئەویش مانگی (رجب)ە کەدەکەوێتە نێوان (جمادی)دووهەم و(شعبان)، لەوەودوا فەرمووی: خوایە ئایا پەیامەکەم گەیاند ؟!

خوایە تۆ بەشایەت بە.

...خەڵکینە ئافرەتەکانتان مافیان هەیە بەسەرتانەوە ئێوەش مافتان هەیە لەسەریان. ئافرەتەکان بارێگە نەدەن کەسێك بێتە ماڵیان کەمێردەکەیان پێی ناخۆش بێت، پیاوانیش بەهەمان شێوە خەڵکینە لەقسەکانم چاك تێ‌بگەن، من دووشتم بۆ بەجێ هێشتوون ئەگەر دەستی پێوە بگرن و پەیڕەوی بکەن هەرگیز گومڕانابن کە بریتین لەقورئانی پیرۆزو سوننەتەکانم، خەڵکینە گوێڕادێرن بۆ قسەکانم و لێی تێبگەن: موسڵمان برای موسڵمانە، موسڵمانان برای یەکن، لەبەرئەوە حەڵاڵ نیە هیچ موسڵمانێك شتێك لەموسڵمانێکی تر بسێنێ مەگەر بەرەزامەندی، ستەمیش لە خۆتان مەکەن، خوایە شایەتبە من گەیاندم. بەو شێوەیە هەر کاتێك بڕگەیەکی فەرمایشتەکەی تەواو دەکرد بەخەڵکەکەی دەفەرموو خەڵکینە ئاگاداربن... ئایا پەیامەکەم گەیاند؟! ئەوانیش دەیانوت: بەڵێ

لەوکاتانەشدا ئەم بەشە ئایەتەی (سورەتی مائدة) نازڵ بوو ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً﴾ (المائدة/٣).

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) عەرەفاتی جێهێشت و لە(مزدلفه) مایەوە، ئینجا ڕەمزی شەیتانی بەردباران کرد لەعەقەبە، لەوەو دوا بەدەستی پیرۆزی چەند وشترێکی کردە قوربانیو گۆشتەکانی بەخشییەوە بەسەر موسڵمانانی هەژارو نەداردا، پاشان سەری تاشیو بەرەو(البیت الحرام)تەشریفی بردو (طواف)ی (الأفاضة)ی کردو(صفا)و(مروة)ی ئەنجامداو لەوەو دوا گەڕایەوە بۆ میناو خێروخێراتی زۆری بەخشییەوەو ڕۆژی دواتر دوبارە ڕەمزی شەیتانی بەرد باران کرد. لەو ماوەیەدا ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد چونکە خەڵکەکە کەدڵیان ناسك و دەرونیان ئامادەیی تێدابوو. بەو شێوەیە سەرجەم کارەکانی حەجی گەورەی تەواوکرد .

لەکۆتایی (ذي الحجة)دا پێغەمبەر(ﷺ)گەیشتەوە(مدینه) کاتێك چاوی بەشار کەوت سێجار(الله اكبر)ی کرد پاشان فەرمووی: باشترین وتەیەك کە پێغەمبەرانی پێش من فەرموویانە: (لاإله إلا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، آيبون تائبون عابدون لربنا حامدون . صدق الله وعده ونصر عبده وهزم الأحزاب وحده ).

**ڕۆمەکان کەوتنە خۆ !!**

پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێگەیشت کەڕۆم دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر (مەدینە)، خەڵکی هەمووی خۆی ئامادەکرد لەکۆتایی مانگی (صفر)دا سوپایەکی لەهاوەڵان پێکهێنا (أسامه)ی کوڕی(زید)ی کردە سەرکردەی کە لە تەمەنی ١٧ساڵیدا بوو، لەکاتێکدا کەسانی وەکو (ابوبکر)و (عمر ) هەبوون بەڵام سوپا لەشوێنی خۆیدا نەجوڵا، چونکە غەمێکی گەورە پێشهات، ئەویش نەخۆش

کەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، هەر بۆیە سوپاکەی (أسامە ) دواکەوت بەتایبەت هەندێك دەیانوت: منداڵێکی کەم تەمەنی لەنێو ئەم هەموو کۆچبەرو پشتیوانانەدا کردوە بەسەرکردە !!

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕەخنەیەی بیست، لەماڵ هاتە دەر، سەری بەستبوو فەرمووی: خەڵکینە ناردنی سوپاکەی(أسامە ) جێبەجێ بکەن، ئەوەی دەربارەی (أسامە) دەوترێت، کاتی خۆی بەباوکیشی وترا، بەڕاستی ئەو شایستەی سەرکردایەتی‌یەو باوکیشی شایستە بوو، ئەوەبوو ئیتر سوپاکەی (أسامە) بەرێکەوت و لەنزیك مەدینەوە سەربازگەی هەڵدا ناساغی پێغەمبەریش(ﷺ) تادەهات توند تردەبوو، ئیتر (أسامە) خۆی پێنەگیراو گەڕایەوە (مدینە)، تا لەسەردەمی (ابوبکر)دا ڕێکەوت و دوژمنی ترساند، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ)لەجەنگی (تبوك)دا ناحەزانی ترساند، ئەوسا بەسەربەرزی گەڕایەوە (مدینە)و ئامانجی خۆی پێکا، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەرکی سەنگینی خۆی بەئەنجام گەیاند ئەمانەتی سەرشانی جێبەجێ کرد، پەیامی خوای گەیاند ڕۆژێك چووە سەر مینبەرو فەرمووی: بەندەیەك لەبەندەکانی خوا پەروەردگاری سەرپشکی‌کردوە لەنێوان ڕازاوەیی دنیاو ئەوەی لای خۆیەتی، ئەویش لای خوای هەڵبژاردوە.

(أبوبکر) دڵی پڕبوو، زانی کە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی خۆیەتی، بۆیە بەگریانەوە فەرمووی: (یارسول الله) دایك وباوکمان بەقوربانت بێت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (أبوبکر) چاکترین هاوەڵ و دڵسۆزترین کەسمە، ئەگەر دوای خۆم بڕیار بێت دۆستێکم هەبێت ئەوە (أبوبکر) دەبوو هەموو دەرگاکان داخەن دەرگای (أبوبکر) نەبێت. پاشان گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی

بەدوای ئەمەدا ١٣ڕۆژ بەنەخۆشی مایەوە، لەوماوەیەدا بەنۆرە لای هاوسەرانی دەمایەوە، کاتێك نەخۆشیەکەی زیادی کرد، مۆڵەتی لەهاوسەرانی خواست، تا لەماڵی خاتوو (عائشە) دا بمێنێتەوە، ئەوانیش مۆڵەتیاندا .

کاتێك نەخۆشیەکەی زۆری بۆ دەهێناو تاکەی بەرز دەبوەوە داوای دەکرد ئاو بکەن بەسەریدا، سەرەنجام وای لیّ هات نەیدەتوانی بڕوات بۆ مزگەوت، بۆیە فەرمانی‌دا بە(أبوبکر) پێش نوێژی بۆ موسڵمانان بکات، بەڵام خۆی پی‌نەگیراو ناوچەوانی خۆی بەست و هاتەدەرو (علی)و(فضل) چونە ژێر باڵی‌و (عباس) لەپێشیانەوەبوو، تانزیکی مینبەرەکە بوەوەو لەبەر زۆری ئازارەکەی قاچی بەدوای‌دا نەدەهات، لەسەر یەکەم پلەی مینبەرەکە دانیشت سوپاس و ستایشی خوای باڵادەستی‌کردو فەرمووی: پێیان ڕاگەیاندووم کە ئێوە لەمردنی پێغەمبەرەکەتان دەترسن، ئایا هیچ پێغەمبەرێکی پێش من لە ژیاندا ماوەتەوە تا من لەنێوانتانا بمێنمەوە؟! من ئەڕۆم و بەخوای خۆم دەگەم، ئێوەش بەدوای مندا دێن، بیرتان دەخەمەوە لەگەڵ کۆچبەراندا باش بن کۆچبەرانیش لەنێو خۆیاندا چاك بن، پاشان سورەتی (العصر)ی خوێندو فەرمووی بەپشتیوانی خوا کارەکان باش ئەنجام دەدرێن ئێوە پەلە مەکەن، خوای گەورە بەهۆی پەلەو هەڵەشەیی کەسەوە پەلە ناکات، ئەوەی بیەوێت بەسەر ویستی خوادا سەر بکەوێت خوا بەسەریدا سەردەکەوێت، ئەوەی بیەوێت فێڵ لەخوا بکات، فێڵەکەی بەسەر خۆیدا دەشکێنێتەوە ...

وەسیّتتان بۆ دەکەم لەگەڵ پشتیوانان‌دا باش بن ئەوانەی بەهۆی ئیمانیانەوە خۆیان بە خاوەن ماڵ نەزانی‌و لەماڵ و حاڵ بەروبومیاندا بەشداریان کردن، هەرچەندە خۆیان پێویستیان پیّ‌ی هەبوو، بەڵام لە هیچ شتێك بیّ‌بەشیان نەکردن! هەر کەسێك لە ئێوە لەنێوان دوو کەسدا داوەری کرد، با چاکەی چاکان



لەبەرچاو بگرێت، لێبوردەش بێت لەبەرامبەر ناباشەکان، با بەرخودانتان هەبێت، من پێش ئێوە دەکەوم و ئێوەش بەدوای مندا دێن، وادەی نێوانمان سەر حەوزی (کوثر)ە ئەوەی دەیەوێت لەوێ پێم بگات بادەست و زمانی لەپێویستا نەبێت و نەخاتە کار.

﴿رۆژێك موسڵمانانندا لەنوێژی بەیانیدا بوون،(ابوبکر) پێش نوێژی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەبێ هۆشی بەئاگا هاتەوەو هەستی بەسوکی لاشەی کرد بۆیە چووە مزگەوتەوە بۆلایان، زۆر دیمەنی موسڵمانانی پێخۆش بوو کەنوێژی بەکۆمەڵیان دەکرد لەپشت (ابوبکر)ەوە بۆیە بەبینینی ئەم دیمەنە زەردەخەنەیەکی کرد، کاتێك هاوەڵان پێغەمبەریان(ﷺ)بینی وایان زانی چاك بوەتەوە لەخۆشیدا خەریك بوو نوێژەکەیان ببڕن (ابوبکر) ویستی لە شوێنی خۆی بێتە دواوە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو نوێژەکە تەواو بکە، ئینجا لەلای ڕاستیەوە بەئیمامەتی (ابوبکر) نوێژەکەی دابەست کاتێك نوێژەکە تەواو بوو ئاوڕی بۆ خەڵکەکەدایەوەو بەدەنگی بەرز بەجۆرێك خەڵکی دەرەوەی مزگەوتەکە گوێیان لێبوو فەرمووی: ((خەڵکینە ئاگری دۆزەخ کڵپەی سەندوە، بەڵاو فیتنەش خۆیان مەڵاس داوە دەڵێی شەوە زەنگی تاریکن (واللە) ناحەزان ناتوانن هیچ ڕەخنەیەکم لێ بگرن، (واللە) ئەوەی قورئان حەڵاڵی نەکردبێت حەڵاڵم نەکردوە ئەوەیشی قورئان حەرامی نەکردبێت حەرامم نەکردوە، خوای گەورە نەفرینی لەو کەسانەکردوە کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردۆتە مزگەوت ))﴾

جاهێشتا کاتی چێشتەنگاوی ئەو ڕۆژە نەهاتبوو پێغەمبەر(ﷺ)بەدەم فەرمایشی (الی الرفیق الأعلی ) ... گیانی پاکی سپارد سڵاوو ڕەحمەت بۆ



سەرگیانی پاکت ئەی (رسول الله) ئەی پێغەمبەری میهرو سۆز هەروەها لەسەر خانەوادەو سەرجەم هاوەڵان و شوێنکەواتوانت.

شایانی باسە لەکاتی سەرەمەرگدا خاتوو (فاطمة)ی کچی هاتوو وتی: ئای لەو تەنگانەو بەلایەی باوکم تێی کەوتوە !!... پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: لەمڕۆ بەدواوە بەلاو تەنگانەو نارەحەتی لەسەر باوکت نەما، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ (فاطمة) کرد کە گوێچکەی بێنێ چرپەیەکی بۆ کرد (فاطمة) دەستی کرد بە گریان، پاشان چپەیەکی تری بۆکرد ئەمجارەیان پێکەنی، لەدوای کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) خاتوو (عائشە) نهێنی ئەو گریان و پێکەنینەی لە(فاطمة ) پرسی، ئەویش وتی: چرپەی یەکەم فەرمووی کە: کەپاش کەمێکی تر وەفات دەکات بۆیە گریام، لەچرپەی دووەمدا فەرمووی تۆیەکەم کەس دەبیت بەم زوانە پێم دەگەیت بۆیە پێکەنیم :

ئەم بەڕێزی کچی بەڕێزە لە لوتکەی لاوێتیدا بوو بەشەش مانگ دوای کۆچی باوکی وەفاتی کردو (حسن)و(حسین)ی لەدوا بەجێما لەبەرەبەیانی ڕۆژی دوو شەمەی (ربیع الأول )دا (ابوبکر) پێش نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ)هەڵسایەوەو دەرگای ژوورەکەی کردەوەو سەیری (ابوبکر)ی کرد نوێژ دەکات بۆ هاوەڵان و بە دڵێکی بەکوڵ قورئان دەخوێنێت و ئەسرین دەڕێژێت پێغەمبەر(ﷺ)دوازەردەخەنەی کرد لەخۆشی نوێژەکەیان، دەگێڕنەوە ڕوخساری پێغەمبەر(ﷺ)وەك خۆری هەڵاتوو لەبەرەبەیان دەرکەوت وتیان هیچ کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)ئەوەندە بەجوانیو بە ڕووناکی نەبینراوە!! خاتوو (عائشە) دەربارەی کۆتا ساتەکانی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت سەری لەنێوان سنگم وشانمدا بوو (جبریل) هاتە خزمەتیو فەرمووی(یارسول الله)فریشتەی مەرگم لەگەڵدایە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی جبریل مۆڵەتی بدە با



بێتە ژورەوە ئەویش هاتە ژوورەوەو فەرمووی : (السلام علیك یارسول الله)...خوای گەورە ناردوومی پێت ڕابگەیەنم ئازادی لە نێوان مانەوە لە دنیادا یان گەیشتن بە پەروەردگارت !! پێغەمبەر(ﷺ)دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی:(بل الرفیق الأعلی)..خاتوو (عائشە) دەڵێت بەوەدا زانیم کە لەنێوان دوو ئەگەردا سەرپشك کراوە چونکە فەرمووی: بەڵکو گەیشتن بە پەروەردگاری ئازیزم دەوێت، بەڵێ لەسەر سنگی خاتوو (عائیشە)وە هەر دەیفەرموو (بل الرفیق الأعلی، بل الرفیق الأعلی)و بەدەم زەردەخەنەوە فریشتەی مەرگ بەراسەریەوە وەستاو فەرمووی: ئەی خاوەنی گیانە پاکەکە گیانی (محمد)ی کوڕی(عبدالله) برۆ دەرەوە بەرەو ڕەزامەندی پەروەردگارو ئەو خوایەی کە لێت تورەنیە خاتوو (عائشە) دەڵێت ئیتر دەستە پیرۆزەکانی شل بوون و کەوتنە سەر زەوی‌و سەری قورس بوو لەسەر سنگم، زانیم کە گیانی‌سپاردووە، ئیتر نەمزانی چی بکەم، هیچ ڕێگایەکم لەبەردەم نەبوو ئەوە نەبێت ئەو دەرگایەم کردەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)لێوەی هاتووچۆی مزگەوتی لێ دەکرد، هاوەڵان سەریان لەم دەرگا کردنەوەیە سوڕما، هاوارم کرد (رسول الله) وەفاتی کرد، (رسول الله) وەفاتی کرد هەرکەگوێیان لە هاوارەکەم بوو زۆرێکیان بورانەوە (علی)م بینی بە پێوەبوو یەکسەر دانیشت و نەیتوانی بەپێوە بوەستێ، (عثمان)یش مندالآن دەستیان گرتبوو بەراست و چەپدا دەیان برد بێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێت، خاتوو(فاطمة)یش هەوڵیدا ئارام بگرێت چونکە پێغەمبەر(ﷺ)ئامۆژگاری کردبوو بەئارامگرتن بۆیە بەدەم ئازارەوە دەیوت.. ئای باوکە گیان... بەدەم داخوازی پەروەردگارتەوە چوویت!!؟ باوکی ئازیزو بەڕێزم بەهەشتی فیردەوسە شوێنی نیشتەجێت، باوکە گیان ڕۆیشتی بۆلای جبریل، هەرئەمانەی دەوتەوە هەتا



ئارامی بدات بەخۆی، (عمر)یش کە هەواڵەکەی بیست شمشێرەکەی هەڵکێشاو هاواری کرد هەر کەسێك بڵێت پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە لەگەردنی ئەدەم، ئەو نەمردووە بەڵکو تەشریفی بردوە بۆ دیداری پەروەردگاری، وەك چۆن (موسی) دەچوو بۆ گفتوگۆ لەوکاتەدا (ابوبکر) هاتە نێو مزگەوت و فەرمووی: خەڵکینە ئەوەی (محمد)ی دەپەرست (محمد) کۆچی دوایی کرد ئەوەیشی خوای گەورە دەپەرستێت ئەو زاتە هەردەمێنێت و نامرێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کەدەفەرموێت:﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ﴾(آل عمران/١٤٤)، پاشان بەپەیڕەوی وەسیەتەکەی شتیان و کفنیان پۆشیو لەژوورەکەی خۆیدا ئەسپاردەیان کرد، هەزاران هەزار درودو سلاو لەسەر گیانی پاك و ڕۆحی ڕەوانی ئەو پێغەمبەرە سەردار بەڕێزو ئازیزو خۆشەویستە بێت.



لەخوای بالآدەست دەپاڕێمەوە ئەم بەرهەمە بکاتە توێشویەکی بەبرِشت بۆئەو ڕۆژەی کە ئاتاجی هەموو کارێکی بچوکین بەدوای شریتی تەمەنی دونیاماندا دەگەڕێین و بەوکارانە دڵ خۆشین کە بەتەواوی لەبەر خوای پەروەردگار کردومانە تا سەرفرازی ڕۆژی دوایی بین بە هۆیەوە، شایستەی ئەوەبین لەئاوی (کوثر) بەدەستی موبارەکی ئەو زاتە خۆشەویستە تێر ئاوبین لەگەڵ مامۆستا بورهان و سەرجەم ئەو براو خوشکانەی بەشداری ئامادەکرنی ئەم ژیننامە پیرۆزەیان کردووە بە نیازی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار ...

وآخر دعونا ان الحمد لله رب العالمین

ئامانج محمد امین ئەردەلآنی ۱٤ /۱۲/ ۲۰۰٦ هەینی .



## پێڕست

